


کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: محمد خضر أحمد
لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری
لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ مەحمود بەرامبەر مزگەوتی محمود عەلاف
-------------------------------------------------------
٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤
mdmaktaba@gmail.com
https://www.facebook.com/M.Ktebxana

ناوی کتێب: سەد فکرە بۆ ڕەمەزان

ناوی نووسەر: حسن علی بۆسکێنی

دیزایینی ناوەوە: بڕیار هێرۆیی

دیزایینی بەرگ: زەردەشت کاوانی

هەڵەچن و ڕێنووس: بڕیار هێرۆیی

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢١

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (١٠٥٦)ی ساڵی (٢٠٢١)ی پێدراوە

پێشکەش

پێشکەشە بە هەموو ئەوانەی کە لەپێناوی خودا بەرۆژوون، وە بەوانەی پێشنیاری کردنە کتابی ئەو فکرانەیان کرد، وە مامۆستا سەرداری زێدە ئازیز کە دەورێکی باشی هەبووە لە بڵاوکردنەوەی فکرەکان، وە بە کاک پاکزادی کوڕم کە ئەرکی ڕێکخستنی ئەم فکرانەی لەئەستۆگرت.

# پێشەکی

الحمدلله الذي علم بالقلم علم الانسان مالم يعلم والصلاة والسلام على نبيه الأكرم وعلى آله وصحبه أولي المكارم والهمم . . .

گومان لەوەدا نییە کە مرۆڤی مسوڵمان خاوەنی پەیامە، ئەو پەیامەش ئیسلامە، ئیسلام دەبێتە چەند بەشی سەرەکی، لەوانە: بیروباوەڕ، عیبادەت، ئەخلاق، مامەڵەکان، سێ بەشی یەکەم لە شەریعەتدا جێگیرە و گۆڕانی بەسەردا نایەت، بەڵام مامەڵەکان قابیلی گۆڕانکارین بەپێی سەردەمەکان و پێویستییەکان، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە هەمووی قابیلی گۆڕانە و جێگیری تێدا نییە، بەڵکو ئەوانیش بنچینەیان بۆ دانراوە، لەژێر سایەی ئەو بنچینانە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ. عیبادەتەکان کاریگەری تایبەتی خۆیان هەیە، لە گرنگترینی عیبادەتەکان: نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەجکردن، قورئان خوێندن، زیکر، دوعا، قوربانی، نەزر ... هتد.

یەکێک لەو عبادەتانە ڕۆژوویە کە ساڵانە دووبارە دەبێتەوە، وە کاریگەری بەرچاوی لەسەر کۆمەڵگەی بەشەری هەیە بەگشتی و کۆمەڵگای مسوڵمانان بەتایبەتی، بۆیە مسوڵمانان دەبێ ئەم شنەی ڕەحمەتە بقۆزنەوە و زۆرترین سوودی لێ ببینن، وە لەو بوارەدا چەندین نووسین و بەرنامەی جوان هەن، منیش ویستم شان بە شانی برایان و خوشکانم خزمەتێک پێشکەش بکەم سەبارەت بە قۆستنەوەی هەلی ڕەمەزان، ئەوە بوو بیرم کردەوە ئەو شتانەی کە پەیوەندی بە ڕەمەزانەوە هەیە بەپێی



توانا کۆیان بکەمەوە و بەشێوەی خاڵبەندی باسیان بکەم بۆ ئەوەی وەک مەتنێک وا بێت بۆ گرنگترین کارەکان لە ڕەمەزاندا، بەتایبەت بۆ مامۆستایانی ئازیزی خۆشەویست.

ئەم کارەم ناونا سەد فکرە بۆ ڕەمەزان، یاخود توێشووی ڕەمەزان، لەو ماوەیەش کە بڵاوم کردەوە، بەشێک لە دڵسۆزان لە خوشکان و برایان پێیان باش بوو بیکەمە کتاب، منیش پێشنیارەکەی ئەوانم پێ باش بوو و ناوی خودام لێهێنا و کردم بە کتاب، بە هیوای سوود بینین و دوعای بەخێر، من بابەتەکانم کە نووسیوە نە سەرچاوەکانم نووسیوە، نە بەڵگەم بۆ هێناوەتەوە، چونکە ئەم بابەتە تەنیا وەبیرخستنەوەیە نەوەک تەواوی ڕوون کردنەوەکە، وە ئەگەر وام بکردبا ئەوە بێگومان چەند بەرگ دەردەچوو، منیش ویستم بەزووترین کات بگاتە بەر دیدی خوێنەران.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وآله

# فکرەی یەکەم: فەلسەفەی ڕۆژوو

١. گرنگیدان بە فەلسەفەی ڕۆژوو بەتایبەت لەلایەن مامۆستایان و پسپۆڕان لە شەریعەت، جا هەر کەسێک بن.
٢. جێبەجێکردنی فەرمانی خودایە.
٣. شوێنکەوتنی پێغەمبەرانە.
٤. پەیوەستبوونە بە ئوممەتانی پێشووەوە، چونکە ڕۆژوو لەسەر ئەوانیش فەرز بووە.
٥. تەحقیقی عیبادەتە کە مرۆڤ لەپێناویدا دروست بووە.
٦. بەرز بوونەوەی باڵانسی ڕووحییە کە لەمڕۆدا مرۆڤەکان خەریکە لە ماددییات نقوم دەبن.
٧. مرۆڤ دەبێتە خاوەنی ئیرادەی خۆی و کۆنترۆڵی خۆی لە دەست خۆیدا دەبێ.
٨. بەدیهاتنی دادگەرییە.
٩. فێربوونی ئارامگرتنە.
١٠. جێبەجێکردنی پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلام.
١١. زیکرکردنە.
١٢. قورئان خوێندنە.
١٣. لەشساغییە.
١٤. بەشداریکردنی هەژارانە لە برسییەتی.
١٥. مسۆگەرکردنی دەرگای ڕەییانە کە یەکێکە لە دەرگاکانی بەهەشت.
١٦. دەرفەتە بۆ زەکاتدان بەتایبەت زەکاتی فیترِ.
١٧. شەونوێژ کردنە.
١٨. ئاوەدانبوونەوەی مزگەوتەکانە.
١٩. ڕەشبوونەوەی تاوانەکانە.
٢٠. (ليلة القدر)ی تێدایە.
٢١. کاتی ئیعتکافکردنە.



٢٢. مانای ئیستقلالی و سەربەخۆیی بوونە، ڕاستە ئوممەتانی دیکەش بەڕۆژوو بوون، بەڵام ڕۆژوو لە ئیسلامدا تەواو جیاوازە.
٢٣. ڕەمەزان مێژووی ڕووداوە گەورە و سەرکەوتنەکانی ئوممەتی ئیسلامە.
٢٤. کاتی نازل بوونی قورئانە.
٢٥. دەرگای تەوبەکردنە.
٢٦. ڕزگاربوونە لە بەخیلی و چرووکی.
٢٧. یەکترناسینە لە مزگەوتەکان.
٢٨. کاتی خەندەی هەژارەکانە.
٢٩. جوبرائیل و فریشتەکان ئوممەت بەسەر دەکەنەوە.
٣٠. ئاشنابوونەوە و پەیوەندی ئاسمان و زەمینە بەهۆی قورئانەوە، دوای زیاتر لە شەش سەد ساڵ دابڕان.
٣١. فێربوونی ئەحکامەکانی ڕۆژوو، نوێژ، شەونوێژ، تەوبە، زەکاتدان.
٣٢. کاتی عەمرەکردنە.
٣٣. کاتی فرمێسک داباریینە.
٣٤. کاتی کەلەپچەکردنی شەیتانەکانە.
٣٥. پەیدابوونی ڕووحی موقاوەمە و شۆڕشگێڕییە.
٣٦. بەرزبوونەوی باڵانسی ئیمانە.
٣٧. بەدەستخستنی تەقوایە.
٣٨. شەیتانەکان کەلەپچە دەکرێن.
٣٩. دەرگاکانی ئاگر دادەخرێن.
٤٠. دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە.
٤١. کاتی بەئاگابوونە لە سەحەردا.
٤٢. هەموو ڕۆژێک خەڵکانێک لە ئاگر ئازاد دەکرێن.
٤٣. زیاتر پێکەوە کۆبوونەوەی خێزانەکانە لەسەر سفرە و کاتی عیبادەت.
٤٤. زۆر یادی خودا کردنە.
٤٥. گەنجانێکی زۆر بە دین ئاشنا دەبنەوە.
٤٦. فێری ئەوە دەبین نرخی کات بزانین.
٤٧. زۆرترین زاد و زەخیرە و توێشوو کۆدەبێتەوە.
٤٨. خەڵکانێکی زۆر مسوڵمان دەبن.
٤٩. زۆرترین ئامۆژگاری و وتارت گوێ لێ دەبێ.




٥٠. میدیاكان بە هەموو جۆرەكانیانەوە گۆڕانكاری گەورەیان بەسەردا دێ.
٥١. كەمبوونەوەی لایەنی دڕندایەتی لە مرۆڤ.
٥٢. زەلیلبوونی شەیتان.
٥٣. فێربوونی دەرسی ئیخلاص.

## فکرەی دووەم: پلە و پایەی ڕەمەزان

١. پەیوەندیکردنی ئاسمان و زەوی دوای زیاتر لە شەش سەد ساڵ، جارێکی دیکە کەلامی خودا کە خۆی لە قورئانی پیرۆزدا دەنوێنێ تیشکی دای لە زەوی، کە لەوەتی زەوی هەیە نووری وای بە خۆوە نەبینیوە، وە ڕابەری وەک موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای ﷺ بە خۆوە نەبینی بوو.

٢. لە دەستپێکی ڕەمەزان دنیای جەنگەڵستان کە دوو لەسەر سێی کۆیلە بوون تیشکی ئازادی بەسەردا هەڵهات.

٣. جەزیرەی عەرەبی کە خاوەنی هیچ شارستانییەتێکی ئەوتۆ نەبوو گەورەترین شارستانی دامەزراند.

٤. کۆت و زنجیرکرانی شەیتانە یاخی و سەرسەختەکان، کە ئەمەش بە ئاشکرایی دەبینرێ لە گەڕانەوە و تۆبەکردن و خێر و سەدەقە.

« عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: " إِذَا كَانَتْ أَوَّلُ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ صُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ وَمَرَدَةُ الْجِنِّ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ فَلَمْ يُفْتَحْ مِنْهَا بَابٌ، وَفُتِحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ فَلَمْ يُغْلَقْ مِنْهَا بَابٌ، وَنَادَى مُنَادٍ: يَا بَاغِيَ الْخَيْرِ أَقْبِلْ، وَيَا بَاغِيَ الشَّرِّ أَقْصِرْ. وَلِلَّهِ عُتَقَاءُ مِنَ النَّارِ، وَذَلِكَ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ " ».[١]

٥. ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان گوناهەکان هەڵدەوەرن و دەسوتێن: « " الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ وَالْجُمْعَةُ إِلَى الْجُمْعَةِ وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ مَا اجْتُنِبَتِ الْكَبَائِرُ " ».[٢]

٦. نواندنی سەخاوەتمەندی لە ڕەمەزاندا: « كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ، وَكَانَ أَجْوَدُ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ، وَكَانَ يَلْقَاهُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ، فَيُدَارِسُهُ الْقُرْآنَ، فَلَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدُ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ ».[٣]

٧. عومرەیەک لە ڕەمەزاندا بارتەقای حەجێکە لە غەیری ڕەمەزان: « قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِامْرَأَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ - سَمَّاهَا ابْنُ عَبَّاسٍ ﵁ فَنَسِيتُ اسْمَهَا -: " مَا مَنَعَكِ أَنْ تَحُجِّينَ

---

[١]- سنن الترمذي: ٦٨٢، سنن ابن ماجة: ١٦٤٢.
[٢]- صحيح مسلم: ٢٣٣.
[٣]- صحيح البخاري: ٣٥٥٤.

مَعنَا؟ " قَالَتْ: كَانَ لَنَا نَاضِحٌ فَرَكِبَهُ أَبُو فُلَانٍ وَابْنُهُ - لِزَوْجِهَا وَابْنِهَا - وَتَرَكَ نَاضِحًا نَنْضَحُ عَلَيْهِ. قَالَ: " فَإِذَا كَانَ رَمَضَانُ اعْتَمِرِي فِيهِ؛ فَإِنَّ عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ حَجَّةٌ ". أَوْ نَحْوًا مِمَّا قَالَ ».[١]

٨. ڕەمەزان کاتی شنەباکانی ڕەحمەتە: « " افْعَلُوا الْخَيْرَ دَهْرَكُمْ، وَتَعَرَّضُوا لِنَفَحَاتِ رَحْمَةِ اللَّهِ، فَإِنَّ لِلَّهِ نَفَحَاتٍ مِنْ رَحْمَتِهِ يُصِيبُ بِهَا مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ، وَسَلُوا اللَّهَ أَنْ يَسْتُرَ عَوْرَاتِكُمْ، وَأَنْ يُؤَمِّنَ رَوْعَاتِكُمْ " ».[٢]

٩. دەتوانی ڕۆژوو چەند قات بکەیەوە: « قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ غَيْرَ أَنَّهُ لَا يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئًا " ».[٣]

١٠. نزای کەسی بەڕۆژوو ڕەت ناکرێتەوە: « " ثلاثُ دَعَواتٍ لَا تُرَدُّ: دَعْوَةُ الوَالِدِ لِوَلَدِهِ وَدَعْوَةُ الصَّائِمِ ودَعْوَةُ المُسافِرِ " ».[٤]

١١. بەڕۆژووبوون لە سیفەتە بەرز و دیارەکانی ئەو ئیمانداراەیە کە خودای گەورە بەڵێنی بەهەشتی پێداوە: ﴿ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾ ﴾ الأحزاب: ٣٥، واتا: بەڕاستی پیاوە موسوڵمانەکان و ئافرەتە موسوڵمانەکان وە پیاوە باوەڕدارەکان و ئافرەتە باوەڕدارەکان و پیاوانی هەمیشە گوێڕایەڵ و ئافرەتانی هەمیشە گوێڕایەڵ و پیاوە ڕاستگۆکان و ئافرەتە ڕاستگۆکان و پیاوان و ئافرەتانی خۆگر و بە ئارام وە پیاوانی لەخوداترس و ژنانی لەخوداترس و پیاوان و ئافرەتانی بەخشندە و پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژووەوان و پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاك و پیاوانێ کە زۆر یادی خودا دەکەن و ئافرەتانێ کە زۆر یادی خودا دەکەن خودا ئامادەی کردووە بۆ هەموویان لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە.

---

١- صحيح البخاري: ١٧٨٢، صحيح مسلم: ١٢٥٦.
٢- رواه الطبراني: ٧٢٣.
٣- سنن الترمذي: ٨٠٧.
٤- السنن الكبرى للبيهقي: ٥٩٠٠.

١٢. بەڕۆژووبوون قەڵغانە لەبەردەم تاوان و ئاگردا: « قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " الصِّيَامُ جُنَّةٌ فَلاَ يَرْفُثْ ، وَلاَ يَجْهَلْ وَإِنِ امْرُؤٌ قَاتَلَهُ ، أَوْ شَاتَمَهُ فَلْيَقُلْ إِنِّي صَائِمٌ مَرَّتَيْنِ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ تَعَالَى مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ يَتْرُكُ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَشَهْوَتَهُ مِنْ أَجْلِي الصِّيَامُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا " ».[1]

١٣. بۆنی گۆڕاوی دەمی ڕۆژووەوان لای خودا لە بۆنی میسک خۆشترە. بە پێی هەمان فەرموودەی پێشوو.

١٤. پاداشتی ڕۆژووەوان بێسنوورە بە بەڵگەی هەمان فەرموودەی پێشوو.

١٥. ڕۆژووەوان لە دوو کاتدا زۆر دڵخۆش دەبێ: « " كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ الْحَسَنَةُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ "، قَالَ اللَّهُ ﷻ: إِلَّا الصَّوْمَ، فَإِنَّهُ لِي، وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، يَدَعُ شَهْوَتَهُ، وَطَعَامَهُ مِنْ أَجْلِي، " لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ: فَرْحَةٌ عِنْدَ فِطْرِهِ، وَفَرْحَةٌ عِنْدَ لِقَاءِ رَبِّهِ، وَلَخُلُوفُ فِيهِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ " ».[2]

١٦. ڕۆژوو لەگەڵ قورئاندا تکا بۆ خاوەنەکانیان دەکەن: « أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: " الصِّيَامُ وَالْقُرْآنُ يَشْفَعَانِ لِلْعَبْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يَقُولُ الصِّيَامُ: أَيْ رَبِّ، مَنَعْتُهُ الطَّعَامَ وَالشَّهَوَاتِ بِالنَّهَارِ، فَشَفِّعْنِي فِيهِ، وَيَقُولُ الْقُرْآنُ: مَنَعْتُهُ النَّوْمَ بِاللَّيْلِ، فَشَفِّعْنِي فِيهِ "، قَالَ: " فَيُشَفَّعَانِ " ».[3]

١٧. کەسێک یەک ڕۆژ لەبەر خودا بەڕۆژوو بێ خودای گەورە حەفتا ساڵ لە ئاگر دووری دەخاتەوە: « " مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بَعَّدَ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا " ».[4]

١٨. کەسێک یەک ڕۆژ لەبەر خودا بەڕۆژوو بێ خودای گەورە لە نێوان ئەو و ئاگر خەندەقێک دادەنێ کە بە قەدەر ئاسمان و زەوییە: « قَالَ النَّبِيِّ ﷺ: " مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، جَعَلَ اللَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ خَنْدَقًا، كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ " ».[5]

١٩. ئەگەر کەسێک بە زمانی بەڕۆژووەوە وەفات بکات ئەهلی بەهەشتە: « عَنْ حُذَيْفَةَ ؓ، قَالَ: أَسْنَدْتُ النَّبِيَّ ﷺ إِلَى صَدْرِي، فَقَالَ: " مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ - قَالَ

---

[1]- صحيح البخاري: ١٨٩٤.
[2]- صحيح مسلم: ١٩٥٢.
[3]- مسند أحمد: ٦٤٤٧.
[4]- صحيح البخاري: ٢٦٤١.
[5]- سنن الترمذي: ١٥٤٧.

حَسَنٌ: ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ - خُتِمَ لَهُ بِهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ صَامَ يَوْمًا ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ، خُتِمَ لَهُ بِهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ، خُتِمَ لَهُ بِهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ " ».[١]

٢٠. لە ڕەمەزاندا سوننەتی شەونوێژمان هەیە کە دەیان ئایەت و سەدان فەرموودەی لەسەرە.

٢١. (ليلة القدر)مان هەیە کە باشترە لە هەزار ساڵ بەندایەتی.

٢٢. کۆمەڵێک تاوان هەیە کەفارەتەکەیان ڕۆژووە، وەک زیهار، واتە: وێچواندنی خێزان بە یەکێک لە مەحرەمەکانی خۆت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَـٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۗ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾ المجادلة: ٣ - ٤، واتا: ئینجا ئەگەر یەکێك (بەندەی) دەست نەکەوت، ئەوە با دوو مانگ بەڕۆژوو بێت لەسەریەك پێش ئەوەی بچنە لای یەك، ئەگەر یەکێك نەیتوانی (دوو مانگ بەڕۆژوو بێت)، ئەوە با نانی شەست هەژار بدات، ئەو (کەفارەتانە کە لەسەرتان پێویستکراوە) بۆ ئەوەیە باوەڕ بکەن بە خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ (ملکەچی فەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ بن)، وە ئەوانە سنوورانی خودان، وە بۆ بێباوەڕان هەیە سزای سەخت.

٢٣. تاوانی کوشتنی بە هەڵە: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ ﴾ النساء: ٩٢، واتا: بۆ هیچ باوەڕدارێك ڕەوا نییە باوەڕدارێك بکوژێت مەگەر بە هەڵە، وە هەر کەسێك ئیمانداریك بە هەڵە بکوژێت ئەوە (لەسەریەتی) ئازادکردنی

[١]- مسند أحمد: ٢٣٣٢٤.

کۆیلەیەکی باوەڕدار و (نرخی) خوێنێکیش بدات بە کەسوکاری کوژراوەکە مەگەر ببیەخشن (لە خوێنەکە بەخێری خۆیان)، بەڵام ئەگەر کوژراوەکە لە گەلێك بوو کە دوژمنتان بوون (کافری شەڕکەر بوون) وە کوژراوەکە ئیماندار بوو ئەوە (هەر لەسەریەتی) ئازادکردنی بەندەیەکی ئیماندار، وە ئەگەر (کوژراوەکە) لە گەلێك بوو کە لە نێوان ئێوە و ئەواندا پەیمان هەبوو ئەوە (نرخی) خوێنێك بدەنە کەسی کوژراوەکە لەگەڵ ئازادکردنی کۆیلەیەکی ئیماندار، جا ئەو (بکوژەی دەستی نەکەوت (یان نەی بوو) ئەوە (لەسەریەتی) ڕۆژووگرتنی دوو مانگ لەسەریەك، (ئەم بڕیارە) لێبووردنە لە لایەن خوداوە، وە خودا هەمیشە زانای کاردروستە.

٢٤. کەفارەتی سوێند: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلۡأَيۡمَٰنَۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡۚ وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ المائدة: ٨٩، واتا: خودا لێتان ناگرێ ئەو سوێندانەتان کە نیازی دڵی لەگەڵدا نییە، بەڵام لێتان ئەگرێ (بە گوناهبارتان دادەنێ) بە (شکاندنی) سوێندێ کە بە نیازی دڵ داتان بەستبێت، جا کەفارەتی (سڕینەوەی شکاندنی) ئەو سوێندانە خۆراکدانی دە هەژارە لە خۆراکێکی مامنێوەندی کە دەرخواردی منداڵ و خێزانی خۆتانی دەدەن، یا پۆشاکی دە هەژار، یا ئازادکردنی بەندەیەك، جا ئەوەی دەستی نەکەوت هیچ کام لەمانە ئەوە با سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت، ئەوەی (باسکرا) کەفارەتی سوێندەکانتانە کاتێ کە سوێندتان خوارد و (سوێندەکەتان شکاند)، وە سوێندەکانتان بپارێزن، بەو جۆرە خودا ئایەتەکانی خۆی بە ڕوونی باس ئەکات بۆتان بۆئەوەی سوپاسی بکەن.

٢٥. کوشتنی نێچیر لە حەرەم: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾ ﴾ المائدة: ٩٥، واتا: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە نێچیر مەکوژن لە

کاتێکدا ئێوە لە ئیحرامدان، وە ئەوەتان بە دەستی ئەنقەست بیکوژێ ئەوە لە سەریەتی سەربڕینی وێنەی ئەوەی کە کوشتویەتی لە ئاژەڵ و ماڵات، با دوو پیاوی موسوڵمانی چاك لە خۆتان ئەو بڕیارە بدەن (نێچیرەکە لە بەرانبەر چ ئاژەڵێکدایە) و بەشێوەی قوربانی بگاتە کەعبە و ( لەوێ بیکات بە قوربانی)، یان بە ئەندازەی نرخی قوربانییەکە خۆراك بدات بە چەند هەژارێ، یان بە قەدەر ئەو خۆراکدانە ڕۆژوو بگرێت بۆئەوەی بچێژێ ئۆباڵی کارەکەی، خودا خۆش بووە لەوەی کە تێپەڕی و بەسەرچوو، بەڵام هەر کەسێك بگەڕێتەوە (بۆ سەر ئەو کردەوەیە) ئەوە خودا تۆڵەی بەتینی لێ دەسێنێ وە خودا زاڵە و خاوەنی تۆڵەی بەتینە.

٢٦. ئەو کەسەی حەج بەشێوازی (تمتع) دەکا و ناتوانێ حەیوان سەربڕێت دەبێ دە ڕۆژ بەڕۆژوو بێ: ﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ۚ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۖ وَلَا تَحْلِقُوا۟ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ۚ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِى ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ ۗ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾ ﴾ البقرة: ١٩٦، واتا: حەج و عومرە (تان کە دەست پێ کرد) تەنها بۆ خودا بەتەواوی بیکەن، ئینجا ئەگەر هەر ڕێگە نەدران (قەدەغەکران) ئەوسا چیتان بۆ هەڵسوڕا لە قوربانی (سەری بڕن)، وە سەرتان مەتاشن تا قوربانییەکە دەگاتە جێی دیاریکراوی خۆی، ئینجا هەر کامێک لە ئێوە نەخۆش بوو یان ئازارێک لە سەریدا بوو (ئەگەر سەری تاشی) بریتییەک بدات کە ڕۆژووی (سێ ڕۆژە)، یان خێرێک، یان قوربانییەک بکات، جا کاتێک دڵنیا بوون (ترس نەبوو) ئینجا ئەو کەسەی بەهرەمەند بوو بە بەجێهێنانی عومرە تا کاتی حەج، ئەوە چی بۆ هەڵسوڕا لە قوربانی (بیکات)، وە ئەگەر یەکێک نەیبوو با سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت لە کاتی حەجدا، وە حەوت ڕۆژ کاتێ گەڕانەوە، ئەمە دەبێتە دە ڕۆژی تەواو، ئەمە بۆ کەسێکە کە (خۆی) و کەسوکاری دانیشتووی دەوروبەری (مسجد الحرام) نەبێت، وە لە خودا بترسن، وە بزانن کە بەڕاستی خودا خاوەنی تۆڵە و سزای سەختە.

٢٧. وە ئەو کەسەش لە ژێر بەرگی ئیحرامدا سەری خۆی دەتاشێ، بە بەڵگەی هەمان ئایەتی پێشوو.

٢٨. ئەو کەسەی کە لە ڕەمەزاندا تووشی جوتبوون دەبێ بە زمانی بەرۆژوو لەگەڵ خێزانەکەی: « عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ الْأَخِرَ وَقَعَ عَلَى امْرَأَتِهِ فِي رَمَضَانَ. فَقَالَ: " أَتَجِدُ مَا تُحَرِّرُ رَقَبَةً؟ " قَالَ: لَا. قَالَ: " فَتَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ؟ " قَالَ: لَا. قَالَ: " أَفَتَجِدُ مَا تُطْعِمُ بِهِ سِتِّينَ مِسْكِينًا؟ " قَالَ: لَا. قَالَ: فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ وَهُوَ الزَّبِيلُ، قَالَ: " أَطْعِمْ هَذَا عَنْكَ " قَالَ: عَلَى أَحْوَجَ مِنَّا؟ مَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَحْوَجُ مِنَّا. قَالَ: " فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ " ».[١]

٢٩. ڕۆژوو چارەسەرە بۆ ئەو کەسانەی توانای ژنهێنانیان نییە: « " مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ؛ لِأَنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ " ». وَهَلْ يَتَزَوَّجُ مَنْ لَا أَرَبَ لَهُ فِي النِّكَاحِ؟[٢]

٣٠. لە ڕەمەزاندا عیبادەتی ئیعتیکاف هەیە کە سوننەتی بەردەوامی پێغەمبەر ﷺ بووە: «عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اعْتَكَفَ مَعَهُ بَعْضُ نِسَائِهِ وَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ تَرَى الدَّمَ، فَرُبَّمَا وَضَعَتِ الطَّسْتَ تَحْتَهَا مِنَ الدَّمِ. وَزَعَمَ أَنَّ عَائِشَةَ رَأَتْ مَاءَ الْعُصْفُرِ، فَقَالَتْ: كَأَنَّ هَذَا شَيْءٌ كَانَتْ فُلَانَةُ تَجِدُهُ ».[٣]

٣١. ڕەمەزان کاتی زیکر و نزا و پاڕانەوەیە کە باسی دەکەین.

٣٢. سوڕەتێک لە قورئان بە ناوی قەدرەوەیە کە لە ڕەمەزاندایە.

٣٣. شەوی قەدر شەوی موبارەکە بە دەقی ئایەت: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ٣ ﴾ الدخان: ٣، واتا: بەڕاستی ئێمە ئەم قورئانەمان لە شەوێکی پیرۆزدا ناردۆتە خوارەوە، بێگومان ئێمە ترسێنەرین.

٣٤. شەوی سەلام و ئەمان لە ڕەمەزاندایە کە شەوی قەدرە.

---

١- صحيح البخاري: ١٨١٠.
٢- صحيح البخاري: ٥٠٦٤.
٣- صحيح البخاري: ٣٠١.

## فکرەی سێیەم: چۆن پێشوازی لە ڕەمەزان بکەین

١. پەروەردگار لەبەر ئەو حیکمەتەی کە هەر بۆ خۆی دەیزانێ هەندێک شوێن و کەس و زەمان هەڵدەبژێرێ بەسەر غەیری ئەوانە، وەک ئاسمانی حەوتەم، بەهەشتی فیردەوس، مەککەی موشەڕڕەفە، مەدینەی مونەووەڕە، مزگەوتی ئەقصا، ڕۆژی عەرەفە، ڕۆژی جەژن، ڕۆژی نۆیەم و دەیەمی موحەڕڕەم، ڕۆژی جومعە، وە لەنێو مانگەکانیشدا مانگە قەدەغەکراوەکان، وە لە سەروویانەوە مانگی ڕەمەزان، لەنێو ڕەمەزانیشدا لیلة القدر، وە لەنێو خەڵکاندا پێغەمبەران، لەنێو نێرداوەکانیشدا موحەممەدی کوڕی عبد الله ﷺ، ئەمە ویستی خودایە و کەس بۆی نییە ئینکاری بکات و ڕەخنەی لێ بگرێت، چونکە خۆی خاوەن و مالیکە و ئەوەی بەوە ڕازی نییە با ڕێگای لێ بگرێ ئەگەر دەتوانێ.

٢. پێغەمبەری خودا ﷺ مزگێنی بە هاتنی ڕەمەزان داوە و فەرموویەتی: « " إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ، فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ " ».[١]

٣. ڕەمەزان ڕەحمەت و فەزڵی خودایە، دەبێ دڵمان بە ڕەحمەتی خودا خۆشبێ: ﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ٥٨ ﴾ یونس: ٥٨.

٤. ئەوانەی ڕۆژووی ڕابردوویان لەسەرە با پەلە بکەن بۆ گێڕانەوەی بۆ ئەوەی بە دڵێکی خۆش پێشوازی ڕەمەزان بکەن.

٥. تەمەننا بکەین وە نزا بکەین بگەین بە ڕەمەزان.

٦. خۆمان فێری ئەحکامی ڕۆژوو بکەین.

٧. تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکەین.

٨. بزانین کە ئەمە نیعمەتێکی گەلێک گەورەیە با لە دەستی نەدەین.

٩. خۆمان لە تاوان و زوڵم دەرکەین.

---

[١]- صحيح مسلم: ١٨٠٠.

١٠. دەبێ بزانین کاتی موسابەقە و مونافەسەیە ئەوەی دەیەوێ مونافەسە بکا: ﴿لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾﴾ الصافات: ٦١. ﴿خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ ۚ وَفِى ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾﴾ المطففين: ٢٦.

١١. خۆ ئامادەکردن بۆ قوڕئان خوێندن.

١٢. پێشوازیکردن بە بەڕۆژووبوون لە شەعبان، چونکە پێغەمبەری ئازیز ﷺ زۆر تێیدا بەڕۆژوو بووە.

١٣. دانانی بەرنامە بۆ خەتمکردنی قوڕئان.

١٤. خۆ ئامادەکردن بۆ دوعای زۆر و زیکری زۆر.

١٥. خوێندنەوەی ئەو کتابانەی کە باڵانسی ئیمانی بەرز دەکەنەوە.

١٦. خێرکردن بەوانەی هەژارن بۆ ئەوەی پارشێو و بەربانگی باش بکەن.

١٧. گرنگیدان بە ماڵ و منداڵ و ئامادەکردنیان بۆ پێشوازی لە ڕەمەزان.

١٨. هەوڵدان بۆ چەند بارەکردنەوە و چڕکردنەوەی کردارە باشەکان.

١٩. گرنگیدانی زۆر باش بە جەماعەتەکان.

٢٠. هاندانی ئافرەتان بۆ بەڕۆژووبوون و بەشداری کارایان لە چالاکییەکانی ڕەمەزان.

٢١. گرنگیدانی زۆر بە شەونوێژ و ویترەکان.

٢٢. دیاریکردنی شوێنێک لەنێو ماڵ بۆ عیبادەتەکان.

٢٣. بیر لەوە بکرێتەوە لە ڕەمەزاندا جەلسەی تایبەتمان هەبێ بە خێزان و خانەوادەکەمان.

٢٤. دابین کردنی پێویستییەکانی ڕەمەزان پێش ڕەمەزان بەبێ زیادەڕەوی.

٢٥. وا حیساب نەکەین کە مانگی خواردن و خواردنەوە و چەرەزاتە.

٢٦. بەرنامەش هەبێ بۆ میوانداریکردن و سەردانکردن بۆ زیاتر هاندان و بەشداریکردنی خەڵکانی دیکە لە کاری خێر و چاکە.

٢٧. ئەگەر بکرێ بەرنامەی عومرە هەبێت.

٢٨. ئەگەر ڕۆژانە بەرنامە دابنێین بۆ ڕۆژووشکاندنی میوانەکان بەتایبەت ئەوانەی لە دوورەوە دێن.

٢٩. هەوڵدان بۆ لەبەرکردنی قوڕئان و فەرموودە.

٣٠. ئیمامەکان لە هەر کات زیاتر گرنگی بە مزگەوتەکان بدەن.

٣١. هەوڵدان پێش ڕەمەزان بە مزگەوت لە ڕووی خاوێنی و ڕوناکی و بۆن خۆش کردن و دابینکردنی مصحفی خەت خۆش و نویێ.
٣٢. ڕێکخستنی بڵندگۆکان بەشێوەیەک خۆش بێ و گوێگر ئیزعاج نەکا.
٣٣. گرنگیدان بە گەرمی و ساردی مزگەوت.
٣٤. هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی خەیرات بۆ هەژاران.
٣٥. میوانداریکردنی زانایان و قورئانخوێنان لە شەوانی ڕەمەزان.
٣٦. کەسێک یان چەند کەسێکی دەنگ خۆش و بەتەقوا بۆ پێشنوێژیکردن زۆر کاریگەری هەیە.
٣٧. هەوڵ بدرێ قورئان خەتم بکرێ و بەرنامەی بۆ دابنرێ.
٣٨. با هاوڕێ و هاوکاری باش بدۆزینەوە بۆ ڕەمەزان.
٣٩. ئەو کەسەی کە بێهێز دەبێ بەهۆی بەڕۆژووبوونی مانگی شەعبان با لە پازدە بەولاوە بەڕۆژوو نەبێ.
٤٠. خۆپاراستن لە بەڕۆژووبوونی ڕۆژی گومانلێکراو (یوم الشك).
٤١. لە بواری تەندروستی خۆ ئامادەکردنی ئەو کەسانەی بەهۆی بەڕۆژووبوونەوە نەخۆشییەکەیان زیاد دەکا یان درەنگ چاک دەبێتەوە و نابێ بەڕۆژوو بن.
٤٢. بازرگانەکان خۆ ئامادەکەن بۆ هەرزانفرۆشی، نەوەک وەرزەکە بقۆزنەوە بۆ گرانکردنی کاڵاکان.
٤٣. ئامادەکردنی مەکتەبە لە مزگەوتەکان.
٤٤. کەمکردنەوەی سەیری کەناڵەکان و ئینتەرنێت مەگەر بۆ پێویستی نەبێ.
٤٥. ئەو سەفەر و پێویستییانەی هەن بیانخاتە پێش ڕەمەزان بەپێی توانا.
٤٦. بیانو نەگرین بۆ نەگرتنی ڕەمەزان مەگەر بە عوزری شەرعی نەبێ.
٤٧. لە کاتی جەژن و سەرەتای ڕەمەزان هۆسە و هەرا نەنێینەوە و پابەند بین بە ڕای گشتی.
٤٨. ئاگامان لە شەیتان و هەنگاوەکانی بێ فێڵمان لێ نەکا و کاتمان بەزایە نەدا.
٤٩. بەرنامە دابنێین بە چڕی بۆ منالان و تازە پێگەیشتووان.
٥٠. ئاگادار بین، ئاگاداری خەڵک بکەینەوە لە خزمەتکردنی بەساڵاچووەکان لە کاتی ڕەمەزاندا لێیان بێئاگا نەبین لەبەر خۆمان، وەنەخۆشەکانیش بە هەمان شێوە.
٥١. دەکرێ ئەگەر درامایەکی باش هەبوو بە خێزانی سەیری بکەین.

# فکرەی چوارەم: پەیامی سیاسی ڕەمەزان

١. ڕەمەزان هۆکاری بەیەکەوە بەستنەوەی ئوممەتی ئیسلامییە بە ئوممەتانی دیکەوە لەوانەی کە خاوەنی پەیامی ئاسمانین، ئەمڕۆ خەڵکی دنیا بەگشتی و خاوەن دینە ئاسمانییەکان لە هەر کات زیاتر پێویستیان بە لە یەک نزیک بوونەوەیە، ئەگەر بەتەنیا موسوڵمان و جولەکە و مەسیحی لەگەڵ دینەکانیان ڕاست بن و لادانیان نەکردبا ئەمڕۆ سەر زەوییان هەموو کۆنترۆڵ کردبوو، گومانیش لەوەدا نییە کە زۆرترین لادانیش لە جولەکەکان هەبوو، لەپاشان مەسیحییەکان ئەوجار موسوڵمانەکان.

٢. ڕەمەزان لە هەمان کاتدا نیشانەی سەربەخۆییە، چونکە عیبادەتەکان لە ئیسلامدا وەک خۆیان ماون و خاوەن کاریگەری ڕاستەوخۆ و ئاشکران، وە بەشێوازی زۆر جوان مومارەسە دەکرێن.

٣. پەیامی سیاسی لە ڕەمەزاندا ئەوە بوو کە گەورەترین ئوممەت لە ڕەمەزاندا لەدایک بوو، کە لەم مانگە پیرۆزەدا قورئان دابەزی و نووری خودایی جارێکی دیکە دای لە زەوی بۆ ئەوەی چاکترین ئوممەت لەدایک بێت: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ۗ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾ آل عمران: ١١٠.

وە بۆ ئەوەی ئوممەتی مامۆستا و چاودێر لەدایک بێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ ﴾ البقرة: ١٤٣.

وە بۆ ئەوەی ئوممەتی تاک و تایبەت لەدایک بێت: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ ﴿٩٢﴾ ﴾ الأنبياء: ٩٢، واتا: بەڕاستی ئا ئەمەیە ئایینی

ئێوە کە یەك ئایینە (ئایینی هەموو پێغەمبەران) و منیش پەروەردگارتانم، کەواتا تەنها من بپەرستن.

وە بۆ ئەوەی ئوممەتی خوێندەوار لەدایک بێ کە قورئانە سوێند بە قەڵەم دەخوا.

٤. لە ڕەمەزاندا بە دابەزینی قورئان دەستووری ژیانێکی نوێ لەدایک بوو، هەر چەند قورئان گەورەترە لە دەستوور، بەڵام مەبەستم دەستووری ژیانی سەربەخۆ و هەمە لایەنەیە.

٥. لە ڕەمەزاندا موسوڵمانان بۆ هەتاهەتایە بوونە خاوەنی قائید و پێشەنگ و پێشەوای خۆیان کە پێغەمبەری خوایە ﷺ کە لەهەموو بوارێکەوە تێر و تەواوترینە.

٦. لە ڕەمەزاندا بوو شارستانی و ژیانی نوێی موسوڵمانان لەدایک بوو.

٧. لە ڕەمەزانەوە ئیسلام بەرەو دنیا کرایەوە و خەڵکانی هەموو دنیا پێی سەرسام بوون و باوەشیان بۆ کردەوە.

٨. لە ڕەمەزاندا بوو ئیسلام بەشێوازی نوێ و تایبەت و پاکی لەدایک بوو دوور لە دەستی پاپا و حاخامە زاڵمەکان.

٩. ئیسلام قودسیەتی لە مرۆڤ ستاندەوە و پلەی خودایەتی و نیمچە خودایەتی لێدارنی.

١٠. ڕەمەزان دەستپێکی بەخوێندەوار کردنی جیهان بوو.

١١. ڕەمەزان دەسپێکی ئازادی کۆیلە و هەژارەکان بوو کە دوو لەسەر سێی مرۆڤایەتی کۆیلە بوون.

١٢. ڕەمەزان بەهۆی دابەزینی قورئانەوە دەستپێکی پیادەکردنی دادگەری و یەکسانی بوو.

١٣. ئەوە قورئان بوو مانای مرۆڤ بوون و دایکایەتی و بەشداری کارای بۆ ئافرەت گێڕایەوە.

١٤. ئەوە قورئان بوو مانای تەعاون و هاوکاری بۆ مرۆڤایەتی نوێ کردەوە و بە پێویستی گێڕا.

١٥. ئەوە ڕەمەزان بوو بوو بە دەستپێکی پێکەوە ژیانی ئایینەکان و ڕێز لەیەکتری گرتن.

١٦. ئەوە ئیسلام بوو هات بە مرۆڤایەتی وت:

- هەمووتان لە مەخلوقییەتدا هاوبەشن.
- هەمووتان خالقتان یەکە.



- هەمووتان یەک مەعدەنن.
- هەمووتان یەک مەسیرتان هەیە.
- هەمووتان خاوەنی ئەرک و بەرپرسیارییەتین.
- هەمووتان ئەگەر ڕەنگ و زمانتان جیاوازە بۆ یەکترناسین و حیوارو پێکەوەژیان و کارلێککردنن، نەوەک بۆ سڕینەوە و جەنگ.

١٧. ئەوە ئیسلام بوو تەنیا بە یەک وشەش موساوەمەی لەگەڵ ستەم نەکرد، چ جای دروستی کات و نزای بۆ بکا و پشتیوانی لێ بکا.

١٨. ئەوە ئیسلامە پێمان دەڵێ: زوڵم ڕەتکراوەیە با موسوڵمانیش بیکا، دادگەری داواکراوە و ئامانجە و باشە با کافریش بیکا.

# فكرەی پێنجەم: پەیامی ئابوری ڕۆژوو

١. لە ڕوانگەی دینەوە ماڵ و سامان بڕبڕەی پشتی ژیانی مرۆڤایەتییە: ﴿وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَـٰمًا وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٥﴾﴾ النساء: ٥، واتا: مەیدەنە گێل و کەم ئەقڵەکان ماڵەکانتان لە حاڵەتێکدا خودا ئەو (ماڵانە)ی بۆ کردوون بەهۆی ڕاوەستانی ژیانتان، (وە بێئەقڵەکان) ڕۆزی و خۆراکیان بدەنێ لەو ماڵە و پۆشاکیان بۆ بکەن و گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن بە گفتوگۆیەکی باش.

٢. زیادەڕەوی لە بەخشینیش باش نییە، خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾﴾ الفرقان: ٦٧، واتا: وە کەسانێکن کاتێك ماڵ و سامان خەرج دەکەن (بۆ خۆیان و خێزانیان) نە زیادەڕەوی و نە ڕەزیلی و دەستنوقاوی (تێدا) ناکەن، (بەڵکو) مامنێوەندییە لەو نێوانەدا.

٣. لە قورئاندا دوای ئیمان هیچ شتێک ئەوەندەی بەخشین مەدحی نەکراوە و ڕوون نەکراوەتەوە.

٤. زەکات کە لوتکەی بەخشینە پایەیەکی گرنگی دینی ئیسلامە، وە ئیسلامەتی بێ زەکات نابێ.

٥. کەسابەتی حەڵاڵ یەکێکە لە گەورەترین ڕەوشتی مرۆڤ وە بە جۆرەها شێوە خودای گەورە هانمان دەدات، هەموو ئەو ئایەتانەی باسی بەخشین دەکەن ناڕاستەوخۆ باسی کەسابەتی حەلاڵە، دەنا چۆن دەکرێ ببەخشی بەڵام خاوەنی ماڵ و سامان نەبێت.

٦. زۆربەی تاوانەكان بە پارە و بەخشین قەرەبو دەكرێنەوە، وەک: زیهار، شكاندنی سوێند، جوتبوون لە كاتی بەڕۆژووبووندا، یان نێچیر كوشتن لە حەڕەم یان جوتبوون لەژێر بەرگی ئیحرامدا، یان لەژێر بەرگی ئیحرامدا موو لە خۆت بكەیەوە، وە زۆری دیكەش.

٧. ئەو كەسەی بەڕۆژوو دەبێت، دەبێ حەتمەن زەكاتی فیترِ بدات، واتا ئەم بەخشینە واجبە، هەر وەک زەكاتی ماڵیش واجبە.

٨. پەیامی ڕۆژوو دادگەری و یەكسانییە كە هەموومان ئیلزام دەكا وەكو یەک بەڕۆژوو بین، واتا: دادگەرییەكی ئیجبارییە.

٩. گرفتی مرۆڤایەتی زیادەڕەوی و ئیسراِفە، ڕۆژوو فێری ئەوەمان دەكا زیادەڕەوی نەكەین، بەڵكو لە پێویستیش بگرینەوە.

١٠.پەیامی ڕەمەزان و ڕۆژوو نەهێشتنی چینایەتی و قڕی و پڕییە.

١١.پەیامی ڕۆژوو ئەوەیە هەست بە ئازاری هەژارەكان بكەین و بەشداری بكەین لە ئازارەكانیان، وە باری گران و لاریان بۆ هەڵگرین و ڕاست بكەینەوە.

١٢.لە ڕەمەزاندا زۆربەی مسوڵمانان زەكاتی ماڵ و زەكاتی فیترِ دەدەن، كە ئەوە بە ملیۆنان دۆلار دەخەملێنرێ كە بەبێ ئەزیەت و منەتكردن دەدرێ بە هەژارەكان.

١٣.تەمەنی ڕێكخراوە خێرخوازییەكان زۆر نییە، هەر چەندە بەشێكی بەرچاویان بۆ ئامانجی تایبەتی خێر دەكەن، وەک بەجولەكە كردن و بەگاور كردن و بەمولحید كردن و بەعەلمانی كردن و بەحزبی كردن و بەبنەماڵە كردن، وە بەشێكی بەرچاویش بۆ خودایە و پاداشتی ڕۆژی قیامەتە، بەڵام ئەو دینە چواردە سەدە و نیوە هاوكاری هەژاران دەكات، وە بە پێویستی داناوە و منەتكردنیشی حەرام كردووە و دەشڵێ: بەخشینی شەو لە هی ڕۆژ باشترە، بەخشینی نهێنی لە هی ئاشكرا باشترە.

١٤.ئەمڕۆ ئەگەر پەیامی ڕۆژوو جێبەجێ بكرێ، وە دەوڵەمەندە زەبەلاح و بەرپرسە گەندەڵەكان زەكاتیان بدابا بەدڵنیایی لە هەرێمدا هەژار نەدەما.

١٥.هەر ئەوەی خوشک و دایک و کچەکان لە جوانکاری ناپێویستی سەرف دەکەن بایی ئەوەیە هەزاران هەژار و نەخۆش و بێماڵ لە نەهامەتی ڕزگار بکات.

١٦.ڕۆژوو فێری ئەوەمان دەکا لە حەڵاڵ خۆمان بگرینەوە چ جای لە حەرام، چۆن دەکرێ بەڕۆژوو بی و حەرام خۆر و گەندەڵ و قۆڵبڕ بیت.

١٧.چۆن دەکرێ خۆت بە موسوڵمانی ڕاست بزانی، بەڵام قوتی ئاسایی و موستەحەقی خەڵک ببڕی و باکیشت نەبێ.

١٨.کەواتا ئەی موسوڵمانان لە ڕەمەزاندا هەژارەکان زیاتر چاویان لە هاوکاری ماددییە، ئێوەش دڵیان خۆش بکەن.

١٩.ئێستا زۆر نەخۆش چاوەڕوانی ڕەمەزان دەکا بۆ ئەوەی چارەی خۆی بکات، زۆرێک لە قەرزدارەکان و کرێچییەکان چاوەڕوانی ڕەمەزان دەکەن، جا ئێوەش هیممەت بنوێنن، ئەگەر نیشتانە ببەخشن خەڵک هاندەن لەسەر بەخشین.

# فکرەی شەشەم: پەیامی کۆمەڵایەتی ڕۆژوو

١. خودای گەورە مرۆڤی دروست کردووە بە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی، وەک گوتراوە: ( الإنسان مدنی بالطبع).

٢. هۆکارەکانی چینایەتی لە ئیسلامدا قەدەغەکراون، چونکە مرۆڤەکان جیاوازییان نییە لە بنچینەدا.

٣. مرۆڤەکان بە جیاوازی ڕەگەز و زمان و ڕەنگ و ئایین پێویستییان بە یەکە و تەواوکاریی یەکدین و خاڵی هاوبەشیان زۆرن.

٤. موسوڵمان لەگەڵ موسوڵمان خاڵی هاوبەشی زیاترن، خودای گەورە لەسەری پێویست کردوون هاوکاری یەکدی بن: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢﴾ المائدة: ٢.

ئەم هاوکاری و یارمەتیدانە بە چەندین فەرموودە تەئکیدی لەسەر کراوەتەوە، وەک ئەو فەرموودەیە: « قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لَا يَظْلِمُهُ، وَلَا يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ، كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرُبَاتِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ" ».[١]

٥.

ئەم فەرموودەیە چەند خاڵێکی گرنک لەخۆ دەگرێ، لەوانە:

- موسوڵمانان بران.
- ستەم لە یەکدی ناکەن.
- دەبێ لە پێویستی یەکدیدا بن.
- دەبێ نەهامەتی و ناخۆشی لەسەر یەک لابەرن.
- دەبێ کەموکورتی یەکدی داپۆشن، مەرج نییە بێدەنگ بن، بەڵام بەشێوەیەکی جوان کەموکورتییەکانی بۆ ڕاست دەکاتەوە.

---

[١]- مسند أحمد: ٥٦٤٦.

➢ نابێ پشتی برای خۆی بەردا و تەسلیمی ناحەزی بکا و لە کاتی تەنگانەدا بەجێی بێڵێ.

٦. دەروونی موسوڵمان لە مانگی ڕەمەزاندا لە هەر کاتێک ئامادەترە بۆ بەخشین لەپێناوی خودا، ئەمە بەکردەیی هەست پێ دەکەین

٧. لە بواری خێزانیشدا خاوەن ماڵەکان لە هەر کات زیاتر دەستیان دەکەنەوە بەرانبەر ماڵ و منداڵیان.

٨. هاوکاری هەر کەسێک لە هەر بوارێکی خێر باشترە لە مانگێک ئیعتکاف لە مزگەوتی رسول الله ﷺ، هەر چەند فەرموودەکە لاوازە، بەڵام پێچەوانەی فەرموودەی صحیح نییە.

٩. خۆشەویسترین کردەوە لای خودا ئەوەیە خۆشی بخەیە دڵی کەسێکی موسوڵمان:

« عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: " أَنَّ رَجُلًا جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ وَأَيُّ الْأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " أَحَبُّ النَّاسِ إِلَى اللَّهِ أَنْفَعَهُمْ لِلنَّاسِ، وَأَحَبُّ الْأَعْمَالِ إِلَى اللَّهِ سُرُورٍ تُدْخِلُهُ عَلَى مُسْلِمٍ، أَوْ تَكْشِفُ عَنْهُ كُرْبَةً، أَوْ تَقْضِي عَنْهُ دِينًا، أَوْ تَطْرُدُ عَنْهُ جُوعًا، وَلِأَنْ أَمْشِيَ مَعَ أَخٍ لِي فِي حَاجَةٍ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَعْتَكِفَ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ – يَعْنِي: مَسْجِدَ الْمَدِينَةِ - شَهْرًا، وَمَنْ كَفَّ غَضَبَهُ سَتَرَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ كَظَمَ غَيْظَهُ، وَلَوْ شَاءَ أَنْ يُمْضِيَهُ أَمْضَاهُ، مَلَأَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ قَلْبَهُ أَمْنًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ مَشَى مَعَ أَخِيهِ فِي حَاجَةٍ حَتَّى أَثْبَتَهَا لَهُ، أَثْبَتَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ قَدَمَهُ عَلَى الصِّرَاطِ يَوْمَ تَزِلُّ فِيهِ الْأَقْدَامُ " ».[١]

١٠. دوورکەوتنەوە لە خراپە لە جوانترین سیماکانی ڕۆژووەوانە: « قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ " ».[٢]

بەپێی ئەم فەرموودەیە بەڕۆژووبوونی ڕاستەقینە دوورکەوتنەوەیە لە تاوان و تەزویر و چەواشەکاری و وتەی درۆ.

١١. لە جوانترین سیماکانی بەڕۆژووبوون تەوقیت کردنی موسوڵمانانە بە کات و ئەرکەوە.

١٢. موسوڵمانان لە ڕەمەزاندا زۆرترین یەکدی ناسین و یارمەتیدانیان بۆ دروست دەبێ.

١٣. میدیا باشەکان بەچڕی تەئکید لەسەر داوکاری و برایەتی دەکەنەوە.

---

[١]- المعجم الصغير للطبراني: ٨٦١.

[٢]- صحيح البخاري: ١٩٠٣.

١٤. تۆڕە کۆمەڵایەیتیەکان سیمای ئیمانی و بانگەوازی تەواوی پێوە دیارە.
١٥. منداڵەکان کە بەردی بناغەی کۆمەڵگای داهاتوون زۆرترین هاتنیان بۆ مزگەوت هەیە، وە لە ئێستاوە تێکەڵ بە خەڵکانی باشی شوێنی باش دەبن.
١٦. گەنجان بە هەر دوو ڕەگەزەوە نابێ فەرامۆش بکرێن، بەشێکی زۆریان لە ڕەمەزانی پڕ بەرەکەت ئاشنای مزگەوت دەبن.
١٧. ئافرەتان ڕەمەزانان چالاکتر دەبن، دەبێ گرنگی تایبەتیان پێ بدرێ و ڕێک بخرێن، چونکە ئەوان مەدرەسەی یەکەمن بۆ پەروەردە.
١٨. پەیوەندی کردن بە مامۆستایان بە تەلەفۆن و ڕاستەوخۆ زۆر چڕ دەبێتەوە، دەبێ ئەمە بقۆزرێتەوە.
١٩. دەبێ وانەکان لەسەر ئەخلاق و گیانی لێبوردەیی چڕ بکرێنەوە.
٢٠. پەیوەندیکردن بە خەڵکە بەساڵاچووەکان لە دایک و باوک و دایەگەورە و بابەگەورە زۆر زیاتر بێ، با ئەوانیش بەهرەمەند بن لە ڕەمەزان و دڵیان پێ خۆش بێ.
٢١. بەرنامەی تایبەت هەبێ بۆ دڵخۆشکردنی نەخۆشەکان و خاوەن پێداویستییە تایبەتییەکان.
٢٢. ڕوونکردنەوەی باش بدرێ لەسەر ماددە بێهۆشکەر و سڕکەرەکان و جگەرە و نێرگەلە و ماددە زیانبەخشەکان، چونکە لەم مانگەدا گوێگرتن زۆرە.
٢٣. پەیامی هەرە گەورەی ئیسلام یەکتاپەرستی و دادگەری و دژی زوڵم وەستانەوەیە، دەبێ زۆر ڕوونکردنەوەی لەسەر بدەین.
٢٤. دەبێ ڕۆژوو بکەینە پەیامی ئارامی و ئۆژنی دەروونی و ببێتە چارەسەر بۆ کێشە کۆمەڵایەتییەکان.
٢٥. دەبێ بازرگانەکان قورسای سەر کۆمەڵگە کەم بکەنەوە و زیاتر دەستیان بکەنەوە جیا لە زەکاتی ماڵ و زەکاتی فیتر.
٢٦. گومان لەوەدا نییە هەموو ئەوانەی کە باسمان کردن ڕەمەزان و ڕۆژوو زۆرترین کاریگەرییان تێدا هەیە، بۆیە دەبێ ڕەمەزان بە مانای وشە نوێبوونەوە و بە خۆداهاتنەوە بێ.

برا و خوشکە ئازیزەکان دەزانم هەندێک دووبارەبوونەوە لە خاڵەکاندا هەیە، بەڵام زیاتر بە مەبەستی دیکە دووبارەبوونەوە هەیە، وە دووبارەبوونەوە سێ سوودی هەیە:

- لەبەرکردن.
- پەروەردەکردن.
- پێوە ڕاهاتن و بارگرتن.

## فکرەی حەوتەم: پەیامی تەندروستی ڕۆژوو

١. ئەو عیبادەتانەی کە خودای گەورە لەسەر ئێمەی واجب کردووە ئێمە کە ئەنجامی دەدەین تەنیا لەبەر ڕەزامەندی خودایە، نەوەک بۆ ئامانجی تەندروستی یان ئابوری یان زانستی ... هتد.

٢. ئەم بەندایەتییانە کە خودای گەورە پێویستی کردووە بێحیکمەت و نهێنی نین، ئێمە دڵنیایین چەندین حیکمەتی لەخۆگرتووە، هەندێکیانمان زانیوە پێشتر، هەندێکیان ئێستا دەزانین، هەندێکی دواتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

٣. بەڕۆژووبوون خۆئەزیەتدان و خۆبێبەشکردن نییە لە نیعمەتەکان، بەڵکو پەروەردەکردن و بارهێنان و خۆکۆنترۆڵکردن و ڕزگاربوونە لە بەندایەتی بۆ ئارەزووەکان و نەفس و شەیتان، لە سەرووی هەموویشیانەوە ڕەزامەندی پەروەردگار.

٤. وە ئەم فەڕزە، واتا: ڕۆژوو حەتمی نییە بۆ هەموو کەس، بەڵکو زۆر کەس بەڕۆژوو نابێ بە بیانووی وەک: سەفەر، نەخۆشی، بەساڵاچوون، سووڕی مانگانە، منداڵبوون، شیردان، منداڵی شێتی، دووگیانی، ئەمانە بە ڕەهایی نین، بەڵکو هەندێکیان کاتییە و دەبێ دوای قەزای بکاتەوە، وە هەندێکی قەزا ناکرێتەوە، ئەم بابەتە لە کتابە فقهییەکان بەتەواوی ڕوون کراوەتەوە، کە ئێمەش دواتر لە نێوان ئەو فکرانە چەند بابەتێکی گرنگ باس دەکەین ان شاء الله.

٥. هەر کات ڕۆژوو زیانی بە مرۆڤ گەیاند، نەوەک هەر گوناهە بەڕۆژوو بی، بەڵکو خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ وَأَحۡسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٩٥﴾ البقرة: ١٩٥، واتا: وە دارایی خۆتان بەخت بکەن لە ڕێی خودادا وە بە دەستی خۆتان مەخەنە تیاچوونەوە، وە چاکە بکەن بەڕاستی خودا چاکەکارانی خۆش دەوێت. خۆبەهیلاکدان بە هەر هۆیەکەوە بێ حەرامە و نەهی لێکراوە: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ٢٩﴾ النساء: ٢٩، واتا: خۆتان مەکوژن، چونکە پەروەردگارتان لەگەڵ ئێوەدا بەبەزەیی و میهرەبانە.

٦. لە رووی زانستی و دینی و مێژووییەوە سەلمێنراوە کە رۆژوو لە پێداویستییەکانی ژیانی مرۆڤایەتییە، قورئانی پیرۆز ئاماژە بەم راستییە دەکا کە بەدرێژای مێژوو رۆژوو هەبووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣ ﴾ البقرة: ١٨٣، واتا ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە رۆژووتان لەسەر نووسراوە هەر وەک نووسراوە لەسەر ئەوانەی لەپێش ئێوەدا بوون، بەڵکو خۆتان بپارێزن. میسرییە کۆنەکان بەرۆژووبوون، بەتایبەت پیاوانی ئاینی ماوەی رۆژووەکەیان لە هەفتەیەک تا حەوت هەفتە درێژ بۆتەوە، سینییەکان لە کۆندا بەرۆژووبوون، یۆنانییەکان بەرۆژووبوونیان لە میسرییە کۆنەکان وەرگرتووە، بەرۆژووبوون لای جولەکە و مەسیحی شتێکی ئینکاری نەکراو بووە.

٧. بەرۆژووبوون دیاردەیەکی دیاری نێو زیندەوەرانە، بەشێک لە ئاژەڵان بۆ وەرزێک یان چەند وەرزێک یان چەند رۆژێک هیچ ناخۆن، بەوە بەرگری خۆیان زیاد دەکەن و خۆیان نوێ دەکەنەوە.

٨. لە ( دائرة المعارف البريطانية)دا هاتووە دەڵێ: إن أكثر الاديان، دانها وعاليها قد فرضت الصيام وأوجبته فهو يلازم النفوس في غير أوقات الشعار الدينية. يقوم به بعض الافراد، إستجابة للطبيعة البشرية في بعض مظاهرها.

٩. مرۆڤ کاتێک خۆی دەگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە بەهۆی بەرۆژووبوونەوە مەبەستم کەسی موسوڵمانە چ روو دەدا:

❖ هەستکردن بە برسیبوون بەهۆی ئەوەی کە گەدە خاڵی دەبێ.

❖ لە رۆژەکانی سەرەتا تورەبوون و گرژبوون روو دەدا، بەهۆی ئەوەی کە مرۆڤ دەیەوێ لە حاڵەتی ئاسایی دەرچێ، وە لەبەر هەندێک گۆڕانکاری کە لە لاشەیدا روو دەدا.

❖ دواتر تووشبوون بە کەمێک بێهێزی و لاوازی بەتایبەت ئەوانەی کە کاریان هەیە و ئیشی رۆژانە دەکەن، وە یان ئەوانەی ژەمەکانی پارشێو تەرک دەکەن، وە کۆمەڵێک گۆڕانکاری گرنگ لە لاشەی مرۆڤدا روو دەدەن وەک:

➢ جگەر بەشێکی زۆری لە شەکر هەڵگرتووە، ئەم شەکرە زیادە شوێنەواری خراپی هەیە، بەڵام ئەم شەکرە دەست دەکات بە جووڵە بەرەو توانەوە و چوونە نێو خوێن، بۆ ئەوەی لاشە سوودی لێوەرگرێ بۆ کاتی پێویست و برسیبوون.

- وە هەروەها ئەو چەورییە زیادەی کە لەژێر پێستدا کۆدەبێتەوە و تووشی چەندین دەرد و بەڵامان دەکات.
- وە هەموو لاشە لەو پڕۆتین و مادده زیادانەی هەیەتی وردە وردە خۆی لێ ڕزگار دەکات.
- ماسولکەکان لە (٪ ٤٠)ی ئەم زیادەیە سەرف دەکەن.
- سپڵ لە (٪ ٦٧).
- جگەر لە (٪ ٥٤).
- دڵ لە (٪ ٣).

ئەو ماددانە کە لەبەین دەچن ئەو ماددانە نین کە جەوهەری و پێویستن، بەڵکو ئەمانە بە زۆری زیاد و ناپێویستن.

١٠. دکتۆر ( ماک فادون) لەو دکتۆرە بەناوبانگە جیهانییانەی کە زۆر گرنگی بە ڕۆژوو دەدا دەڵێ: هەموو مرۆڤێک پێویستی بە ڕۆژووە لەبەر ئەوەی ژەهری خواردن و دەرمانەکان لە لاشەدا کۆ دەبێتەوە و نەخۆشی دەکات، وە لەشگرانی دەکات، وە چالاکییەکانی کەم دەکاتەوە، ئەگەر مرۆڤ بەڕۆژوو بوو وەزنی کەم دەکا، هەموو ژەهرەکان دەتوێنەوە.

١١. ئەم دکتۆرانە (هیزیچ لاهمان، بسکسونیا، برشربذ، مولر) ڕۆژوو بە چارەسەری سەرەکی دەزانن بۆ تێکچوونی هەرسکردن، قەڵەوی، هەندێک نەخۆشییەکانی دڵ، جگەر، شەکرە، فشاری خوین.

١٢. دکتۆر محمد الظواهری دەڵێ: لە کۆن و تازەدا چارەسەرەکان سیستەمی خۆراکی بەکاردێنن بۆ چارەسەر و خۆپاراستن.

١٣. ڕۆژوو شکاندن بە خورما، دوکتۆر ئەنوەر موفتی دەڵێ: شەکری خورما لە پێنج خولەکدا لە خوێندا دەتوێتەوە و هەست بە تێری دەکەی، لەبەرئەوەی ڕێژەی شەکر لە خورمادا لە (٪ ٧٠)یە، بەڵام لەو جۆرە شەکرانەن کە دەگۆڕێن بۆ ماددەی بەسوود بۆ لەش، خورما مەعدەنی زۆر بەسوودی تێدایە، وەک: پۆتاسێوم، سۆدیۆم، کالیسیۆم، مەگنیسیۆم، وا باشە ڕاستەوخۆ لەدوای خورما خواردن نان نەخورێ، بەڵکو نوێژی شێوان بکرێ ئەوجار نان بخورێ، وە وا باشە لە کاتی ئێوارە ژەمی قورس نەخورێ، شتە چەورەکان نەخورێ، شۆربایەکی دەوڵەمەند بە پاقلەمەنییەکان و سەوزە بخورێ، بە هەر حاڵ دەبێ وا بکەین ڕەمەزان تەواو تەندروستیمان جێگیر بکا، نەوەک نەخۆش و قەڵەومان بکا.

١٤. ڕۆژوو چارەسەرە بۆ چرچ و لۆچ نەبوونی پێست.

١٥. درەنگ دەرکەوتنی نیشانەکانی پیری.
١٦. دڵێکی خۆش و ئارام.
١٧. گرنگی بدەین بە خواردنی پارشێو ئەگەر کەمێکیش بێ، وە ئەگەر تەنیا هەر ئاویش بێ، چونکە ڕیخۆڵە و گەدەمان خاوێن دەکاتەوە.
١٨. نوێژی تەراویح کاریگەری تەندروستی زۆر باشی هەیە هەم بۆ جومگەکانمان هەم بۆ هەرسکردنی خواردن هەم بۆ دڵخۆشیمان.
١٩. لەدوای بەربانگ یان پارشێو یەکسەر نەخەوین.
٢٠. خواردنە کوڵاوەکان باشتر و تەندروستترن لە خواردنە سوورەوەکراوەکان.
٢١. لەپێش خەوتن بەکارهێنای سیواک یان فڵچە بۆ پاکراگرتنی دەم و ددان.
٢٢. دوکتۆرەکان دەڵێن: ئەگەر سکچوونی توندت هەبوو دەبێ ڕۆژوو بشکێنی، چونکە لاشە زۆر پێویستی بە خوێ و شلەمەنییەکان هەیە.
٢٣. لە کاتی تووشبوون بەم نەخۆشییانە لاشە پێویستی بە هەندێک چارەسەر و خواردنی تایبەت هەیە:

- تایەکی توند.
- هەوکردنی زۆر کە پێویستی بە خواردنی تایبەت و چارەسەر بێ.
- برینی گەدە
- کەم خوێنی
- ئەوانەی تووشی وشکبوونەوە ڕەقبوونی خوێنبەرەکان بوون
- لاوازبوونی دڵ
- بوونی شەکرەیەکی بەهێز کە پێویستی بەچارەسەر و ئاو هەبێ.
- توشبوون بە دابەزینی شەکر لە ڕاددەی پێویست.
- هەندێک لە حاڵەتەکانی دابەزینی خوێن.
- هەندێک نەخۆشی گورچیلە بە توندی کە پێویستی بە چارەسەر و ئاوە.

هەموو ئەم حاڵەتانە دەبێ بە پرسی دوکتۆر و لە ژێر ڕێنمایی دکتۆر چارەسەریان بۆ بکرێ.
٢٤. وا باشە چاو قاوە لە ڕاددەی پێویست زیاتر نەخورێتەوە.
٢٥. خواردنەوە گازییەکان زۆر بە کەمی بخورێنەوە.
٢٦. چەرەزات و شیر باشە لە شەوانی ڕەمەزاندا، هەڵبەتە لە هیچ شتێک زیادەڕەوی نەکرێ.

٢٧. میوە یان شەربەتی میوەکان پێویستن، بەڵام ڕاستەوخۆ لەدوای خواردن نا، چونکە میوەش خواردنە، بەڵکو لەدوای چەند سەعاتێک.
٢٨. هەنجیر و مێوژ دەوڵەمەندن بە مەعدەنە باشەکان.
٢٩. ڕۆژوو چارەسەرێکی باشە بۆ:
- وەزنی زیاد.
- نەخۆشی جومگەکان.
- نەخۆشی پێست.
- چارەسەرە بۆ حاڵەتی توڕەبوون و هەیەجان، بەڵام بە مەرجێک لە مانای ڕۆژوو تێبگەین.

٣٠. تاوانەکان لە ڕەمەزان بەشێوەیەکی بەرچاو کەم دەکەن.
٣١. کابانەکان زۆریان ئاگا لە خواردن ئامادەکردن بێ بەتایبەت چەوری و سوێری و شیرنەمەنی.
٣٢. خواردنەکان جۆری بن نەوەک چەند.
٣٣. سەوزەمەنی باش لەسەر سفرە دابنرێ.
٣٤. خواردنەکان بەقەدەر پێویست بن و زیادەڕەوی تێدا نەکرێ.
٣٥. دوکتۆرەکان خواردن گەرمکردنەوە بە باش نازانن، چونکە دەبێتە هۆکاری ژەهراویبوونی خواردنەکە.
٣٦. کەمکردنەوەی خواردنی قوتو.
٣٧. بەکار نەهێنانی خواردنی سەفەری، مەگەر بە ناچاری و سەفەری بێ.
٣٨. ڕەمەزان دەرفەتی باشە بۆ وازهێنان لە جگەرە و ماددە کحولی و سڕکەرەکان، چونکە بەشێک لەوانە نوێژ دەکەن و بەڕۆژوو دەبن، بەڵام دواتر دەگەڕێنەوە بۆ سەر حاڵەتی پێشوو.

ئەوانەی کەباسمان کرد شەرت نییە بەس بۆ ڕەمەزان بێ، بەڵام ڕەمەزان چڕتر دەبێتەوە، خودای گەورە ڕۆژووی هەموو لایەک قەبوڵ بکات.

## فكرەی هەشتەم: سەركەوتن و ڕووداوەكان لە ڕەمەزاندا

١. گەورەترین ڕووداو لە ڕەمەزاندا دابەزینی قورئانی پیرۆزە.
٢. تاجی پێغەمبەرایەتی خرایە سەر سەری كۆتا پەیامبەر كە (رسول الله)یە ﷺ.
٣. شارستانی ئیسلامی بنیادنرا، چونكە مێژووی پڕشكۆی ئیسلام بە دابەزینی قورئان دەستی پێكرد، ئەویش لە ڕەمەزاندا بوو.
٤. فەرزبوونی زەكاتی فیتڕ لە ساڵی دووەمی كۆچی.
٥. لە (١٧)ی ڕەمەزان شەڕی بەدری گەورە ڕوویدا، كە تێیدا بێباوەڕان شكستی گەورەیان خوارد.
٦. لە هەمان مانگدا ڕوقیەی رضي الله عنها كچی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی كرد.
٧. لە ڕەمەزاندا پێغەمبەری خودا ﷺ زەینەبی كچی خوزەیمەی خواست.
٨. بەڕائەتی عائیشە لە ڕەمەزاندا دابەزی، وەک لە (البدایە والنهایە)دا هاتووە.
٩. فەتحی مەككە لە ڕەمەزاندا بوو ساڵی هەشتەمی كۆچی.
١٠. دامەزراندنی دەوڵەتی ئەمەوی لە ئەندەلوس لە (١٥)ی ڕەمەزاندا بوو.
١١. شەڕی حەطین كە صلاح الدین تێیدا سەركەوت بەسەر سەڵیبییەكاندا.
١٢. دروستكردنی ئەزهەر لە (٣٥٩)ی كۆچی.
١٣. فەتحی ئەنتاكییە لە ساڵی (٦٦٦)ی كۆچی لە ڕەمەزاندا.
١٤. لەدایكبوونی زانای گەورە ئیبن خەلدون لە (٧٣٢)ی كۆچی لە ڕەمەزاندا.
١٥. چونە نێو عمورییە لە (٢٢٣)ی كۆچی لە زەمانی موعتەسەمی خەلیفەی عەبباسی.
١٦. لە (٣)ی ڕەمەزانی ساڵی (١١)ی كۆچی وەفاتی فاتیمەی زەهرا رضي الله عنها كچی پێغەمبەری خودا ﷺ.
١٧. سەركەوتنی موسوڵمانان بەسەر سەڵیبییەكاندا بە سەرۆكایەتی عماد الدین زەنگی لە ساڵی (٥٣٢)ی كۆچی لە (٦)ی ڕەمەزاندا.
١٨. لە (٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٦٦٥)ی كۆچی موحاسەرەكردنی عەكا بە سەرۆكایەتی زاهیر بیبرس.

١٩. لە (٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (٩٢٣)ی کۆچی عوسمانییەکان چوونە نێو غەززە.
٢٠. لە (١٠)ی ڕەمەزانی (٦٢٠)ی زایینی دایکی موسوڵمانان خەدیجە رضي الله عنها وەفاتی کرد.
٢١. لە (١١)ی ڕەمەزانی ساڵی (٦٢٤)ی کۆچی جەنگیزخان مرد.
٢٢. لە (١٦)ی ڕەمەزانی ساڵی (٥٨)ی کۆچی دایکمان عائیشە رضي الله عنها وەفاتی کرد.
٢٣. لە (١٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢١)ی کۆچی خالیدی کوڕی وەلید رضي الله عنه وەفاتی کرد.
٢٤. لە (٢١)ی ڕەمەزانی ساڵی (٩٥)ی کۆچی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی مرد.
٢٥. لە (٢٢)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢٧٣)ی کۆچی زانای فەرموودەناس ئیبن ماجە وەفاتی کرد (رحمە اللە).
٢٦. شکاندی بتەکانی مەککە لە (٢٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (٨)ی کۆچی.

ڕووداوگەلێکی زۆر ڕوویان داوە لە مێژوودا بەس ئەوانەم پێ گرنگ بوون.

## فکرەی نۆیەم: دەوری مزگەوت لە ڕەمەزان و ڕۆژوو

گومان لەوەدا نییە کە باسی ڕەمەزان دەکەین زیاتر لە هەر شتێک مزگەوت دێتە بەرچاومان، ئەوەش لەبەر ئەوەیە زۆر لە چالاکییەکان لە ڕەمەزان لە مزگەوتدا ئەنجام دەدرێن، بۆیە دەبێ گرنگی بە مزگەوت بدەین لە سێ لایەنەوە:

یەکەم: پاکڕاگرتنی مزگەوت بەشێوەیەکی باش نێوەوە و دەرەوە و مرافق و هەموو کەلوپەلەکانی مزگەوت، وە دانانی سەللەی یەدەگ لەنێو مزگەوت و دەرەوە بۆ کلێنس و خاشاکی دیکە، وە هەتا دەکرێ لە مزگەوت خاشاک دروست نەکەین.

دووەم: بۆنخۆشکردنی مزگەوت، کە بەداخەوە کەم گرنگی پێ دەدرێ.

سێیەم: گرنگیدان بە گەرمی و ساردی مزگەوت بەتایبەت لە وەرزی هاوین و زستان، بەداخەوە هەندێک مزگەوت بە دیکۆر زۆر جوانن، بەڵام لە کاتی گەرمادا فێنککەرەوەیەکی نییە، وە لە کاتی سەرماش گەرمکەرەوەیەکی نییە، بۆیە خەڵک زوو لێی بێزار دەبێ و بەپەلەن تا دێنەدەر.

# فكرەی دەیەم: گەورەیی و پێگەی مزگەوت

١. گومان لەوەدا نییە مزگەوت دەوری گرنگی هەیە لە ژیان و پەروەردەی كۆمەڵگەی موسوڵمان، وە لە قورئان و سوننەتدا ئەمە زۆر تەئكیدی لەسەر كراوەتەوە، خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَأَنَّ ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا ١٨ ﴾ الجن: ١٨، واتا: بێگومان مزگەوتەكان تایبەتی خودان، كەواتا لەگەڵ خودادا هاوار لە كەسی دیكە مەكەن.

٢. دەبێ مزگەوتەكان ئاوەدان و تەعمیر بكرێنەوە بە دیكۆر بە ڕووح و نێوەڕۆك: ﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرۡفَعَ وَيُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ٣٦ ﴾ النور: ٣٦، واتا: لە مزگەوتانێكدا خودا مۆڵەتی داوە كە بە گەورە و پاك ڕاگیرێ (بەرز و بڵند دروست كرێت)، زیكر و یادی خودای تێدا بكرێ لەو (مزگەوتانە)دا و تەسبیحاتی خودا دەكەن لە بەیانیان و ئێواراندا. واتا: تەعمیری ماددی مزگەوتەكان ڕێگاپێدراوە، بەڵام نەگاتە حەددی زیادەڕەوی.

٣. ﴿ رِجَالٞ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٞ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوۡمٗا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلۡقُلُوبُ وَٱلۡأَبۡصَٰرُ ٣٧ ﴾ النور: ٣٧، پیاوانێك كە بازرگانی و كڕین و فرۆشتن بێئاگایان ناكات لە یادی خودا و نوێژكردن و زەكاتدان لە ڕۆژێك دەترسن (ڕۆژی قیامەت) كە دڵ و چاوەكان تیایدا (دەگۆڕێن و) ئاوەژوو دەبن. ئەمەش لە ڕووی مەعنەوی و ڕووحی.

٤. سیفەتی ئەو كەسانەن كە دەكرێ مزگەوت ئاوەدان بكەنەوە لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە: ﴿إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمۡ يَخۡشَ إِلَّا ٱللَّهَۖ فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٨ ﴾ التوبة: ١٨، بەڕاستی مزگەوتەكانی خودا ئاوەدان دەكاتەوە كەسێك كە بڕوای هێنابێت

بە خودا و بە ڕۆژی دوایی و نوێژەکانی بەجێهێنابێ و زەکاتی دابێ و لە کەس نەترسابێ بێجگە لە خودا، جا بەڵکو ئەوانە لەو کەسانە بن کە ڕێنموونی کراون.

٥. ڕێگری لە مزگەوتەکان تاوانی هەرە گەورەیە: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَا ۚ أُولَٰئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَا إِلَّا خَائِفِينَ ۚ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١٤﴾ ﴾ البقرة: ١١٤، کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە قەدەغەی مزگەوتەکانی خودا دەکات لەوەی کە ناوی خودایان تێدا ببرێ، وە هەوڵ دەدات بۆ وێرانکردنیان، ئەوانە (کە قەدەغەی خوداپەرستی دەکەن لە مزگەوتەکاندا) بۆیان نییە بچنە مزگەوتەکانەوە مەگەر بەترسەوە، هەیە بۆ ئەوان لە دنیادا ڕیسوایی، وە لە ڕۆژی دواییدا سزای گەورە. کەواتا: گەورەترین ستەم ئەوەیە کە مزگەوتەکان خەرا بکرێن چ لە ڕووی ماددی یان لە ڕووی مەعنەوی، کە لایەنی مەعنەوی ئەوەیە کە مزگەوت لە مەهام و نێوەڕۆکی خۆی بەتاڵ بکرێتەوە.

٦. جاری وایە مزگەوت بە مەبەستی خراپ دروست دەکرێ، وەک: ﴿ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا الْحُسْنَىٰ ۖ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ التوبة: ١٠٧، واتا: وە (لە ناپاکان) ئەوانەی مزگەوتێکیان دروستکرد بۆ زیانگەیاندن (بە موسڵمانان) و خودانەناسی و جیاوازی خستنە نێوان ئیمانداران و بۆ چاوەڕوانیکردنی کەسانێ کە دژایەتی خودا و پێغەمبەرەکەیان ﷺ کردووە لەوەو پێش، بێگومان سوێند دەخۆن (دەڵێن): تەنها چاکەمان ویستووە، بەڵام خودا شایەتی دەدات کە بەڕاستی ئەوانە درۆزنن.

٧. گرنگی مزگەوت لە هەڵسووڕێنەران و مەهامەکەیدایە: ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۚ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ التوبة: ١٠٨، واتا: هەرگیز نوێژی تێدا نەکەی (ئەی موحەمەد ﷺ ) بێگومان مزگەوتێك کە لەسەر بناغەی تەقوا و لەخوداترسان دامەزرابێ لە یەکەم ڕۆژەوە شایستەترە کە نوێژی تێدا بکەیت، پیاوانێکی تێدایە پێیان خۆشە کە خۆیان

خاوێن و پاك بکەنەوە خودایش زۆر پاك و خاوێنانی خۆش دەوێ: ﴿ أَفَمَنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقۡوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٍ خَيۡرٌ أَم مَّنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٖ فَٱنۡهَارَ بِهِۦ فِي نَارِ جَهَنَّمَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٠٩ ﴾ التوبة: ١٠٩، واتا: جا ئایا کەسێ بناغەی مزگەوتەکەی دامەزراندبێت لەسەر خوداناسی و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا چاکترە یان کەسێ بناغەی مزگەوتەکەی دامەزراندبێت لەسەر لێواری کەندەڵانێکی فشەڵ و ڕووخەك، جا بە خۆیەوە بڕوخێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە، وە خودا ڕێنموونی کەسانی ستەمکار ناکات.

٨. بەتایبەتیش لە قورئاندا باسی کەعبە و مسجد الأقصى کراوە: ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١ ﴾ الإسراء: ١، واتا: پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە شەو ڕەوی کرد بە بەندەی خۆی لە شەوێکدا لە مزگەوتی بەڕێز و پیرۆزەوە (مەککە) بۆ مزگەوتی (الأقصى) لە (بيت المقدس)، کە دەوروبەریمان پیرۆز و فەڕدار کردووە بۆئەوەی هێندێ لە بەڵگە و نیشانە ڕوونەکانی خۆمانی نیشان بدەین، بەڕاستی هەر ئەو (خودای گەورە) بیسەری بینایە.

٩. خودای گەورە فەرمانی کردووە بە ئیبراهیم و ئیسماعیل کەماڵی خودا پاك بکەنەوە و پاکی ڕابگرن: ﴿ وَإِذۡ جَعَلۡنَا ٱلۡبَيۡتَ مَثَابَةٗ لِّلنَّاسِ وَأَمۡنٗا وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ وَعَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ١٢٥ ﴾ البقرة: ١٢٥، واتا: بیر بکەنەوە کاتێک کە کەعبەمان گێڕا بە پەناگەی خەڵکی و جێی ئاسایش، (پێمان وتن:) شوێنی ئیبراهیم بکەنە جێگەی نوێژ، وە سپاردمان بە ئیبراهیم و ئیسماعیل کە ماڵەکەم پاك بکەنەوە بۆ ئەوانەی کە بەدەوری کەعبەدا دەسووڕێنەوە و ئەوانەی کە تیایدا دەمێننەوە، هەروەها کڕنوشبەران و سوژدەبەران.

١٠. گەورەیی مزگەوت لە سوننەتدا:

أ- هەموو شوێنێک بۆ ئێمەی ئوممەتی موحەممد ﷺ مزگەوتە: « " أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِيَ الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا؛

فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِيَ الْمَغَانِمُ وَلَمْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً " ».(١)

ب- « عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ رضي الله عنهم ذَكَرَتَا كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِالْحَبَشَةِ فِيهَا تَصَاوِيرُ، فَذَكَرَتَا لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: " إِنَّ أُولَئِكَ إِذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ، بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، فَأُولَئِكَ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ " ».(٢) كەواتا: مزگەوتەکان شوێنی تەوحید و خوداپەرستین، نابێ ببنە شوێنی بتپەرستی و وێنەپەرستی.

ت- « قَالَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها: فَابْتَنَى أَبُو بَكْرٍ مَسْجِدًا بِفِنَاءِ دَارِهِ يُصَلِّي فِيهِ وَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَيَتَقَصَّفُ عَلَيْهِ نِسَاءُ الْمُشْرِكِينَ وَأَبْنَاؤُهُمْ، يَعْجَبُونَ مِنْهُ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَوْمَئِذٍ بِمَكَّةَ ».(٣) واتا: وا چاکە لەماڵەوەش مزگەوت و شوێنی تایبەتیمان هەبێ بۆ خوداپەرستی.

ث- « " مَنْ بَنَى مَسْجِدًا لِلَّهِ بَنَى اللَّهُ لَهُ فِي الْجَنَّةِ مِثْلَهُ " ».(٤)

ج- « عَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ السُّيُولَ لَتَحُولُ بَيْنِي وَبَيْنَ مَسْجِدِ قَوْمِي، فَأُحِبُّ أَنْ تَأْتِيَنِي، فَتُصَلِّيَ فِي مَكَانٍ مِنْ بَيْتِي أَتَّخِذُهُ مَسْجِدًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " سَنَفْعَلُ ". فَلَمَّا دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: " أَيْنَ تُرِيدُ؟ " فَأَشَرْتُ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنَ الْبَيْتِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَصَفَفْنَا خَلْفَهُ، فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ ».(٥) ئەم پیاوە عیتبان رضي الله عنه جاری وا هەبوو نەیدەتوانی بێتە مزگەوت لە کاتی لافاو، بۆیە داوای کرد لە پێغەمبەری ئازیز ﷺ بێ لە ماڵەوە شوێنێکی بۆ دیاری بکا بۆ مزگەوت، ئەویش بەدەمییەوە چوو ﷺ، کە ئەمەش گرنگی مزگەوت دەردەخات.

ح- « " لَا يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلَّا حَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ ».(٦) لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتووە « " فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ " »، کە مزگەوتەکانن.

خ- مزگەوت باغ و بێستانی بەهەشتە: « عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " إِذَا مَرَرْتُمْ بِرِيَاضِ الْجَنَّةِ؛ فَارْتَعُوا ". قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا رِيَاضُ الْجَنَّةِ؟ قَالَ " الْمَسَاجِدُ

---

١- صحيح البخاري: ٣٣٥.
٢- صحيح البخاري: ٤٢٧.
٣- صحيح البخاري: ٢٤٦٥.
٤- صحيح مسلم: ١٢١٨.
٥- سنن النسائي: ٨٥٢.
٦- صحيح مسلم: ٢٧٠٠.

". قُلْتُ: وَمَا الرَّتْعُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: " سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ " ».[١]

د- زۆر هەنگاو هەڵێنان بۆ مزگەوت گەورەترین جیهادە: « " أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَرْفَعُ اللهُ بِهِ الدَّرَجَاتِ، وَيُكَفِّرُ بِهِ الْخَطَايَا؟ إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ فِي الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ " ».[٢]

ذ- یەکێک لەو سیفانەی کە لە قیامەتدا لەژێر سایەی سێبەری عەرشی خودان ئەوانەن کە دڵیان لە مزگەوتە و پابەندی مزگەوتە: « " سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ: الْإِمَامُ الْعَادِلُ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ رَبِّهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ، وَرَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ؛ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ أَخْفَى حَتَّى لَا تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ " ».[٣]

---

[١]- سنن الترمذي: ٣٨٥١.
[٢]- مسند أحمد: ٧٢٠٩.
[٣]- صحيح البخاري: ٦٦٠.

## فکرەی یازدەیەم: دەور و کاریگەریی مزگەوت

١. لە کاتی باڵادەستی ئیسلامدا بەتایبەت لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ وە خەلیفەکاندا مزگەوت شوێنی:
- سیاسەتکردن.
- ئیدارە.
- فێرکردن.
- پەروەردە.
- هاوکاری هەژاران.
- شوێنی مانەوەی لێقەوماوان.
- فێربوونی جەنگ و دەرکردنی فەرمانی سەربازی و ڕێکخستن و بەڕێکردنی سوپا.
- پیاوان و ئافرەتان و منداڵان تێیدا کۆ دەبوونەوە.
- بەندایەتییەکانی تێدا ئەنجام دەدرا.
- کێشە و ئاریشەکانی تێدا چارەسەر دەکرا.

بەکورتی مزگەوت شوێنی بەڕێوەبردنی وڵات بوو.

٢. ڕێگریمان لەوە نییە کارەکان بەرەو ڕێکخستن و پسپۆڕی ڕۆیشتوون، بەڵام هەوڵدراوە لە هەمووان زیاتر مزگەوت لە مەهامی خۆی لابدرێت.

٣. مزگەوت کە جومعە و جێژنەکانی تێدا دەکرێ بەردەوام کاریگەری زۆری هەیە لە ئاراستەکردنی کۆمەڵگە.

٤. مزگەوت دەوری تەحقیقی دادگەری هەبووە.

٥. شوێنی هاوکاری هەژارەکان بووە.

٦. شوێنی یەکدی ناسین بووە.

٧. شوێنی تەخەڕوجی ئەدیبان و شاعیران و گەورەپیاوان بووە.

٨. شوێنی ڕزگارکردنی گەنجەکان بووە لە بەدڕەوشتی و مەیخۆری و ماددە سڕکەرەکان.

٩. مزگەوت شوێنی دابارینی ڕەحمەت و بەزەیی خودایە.

١٠. ئەوەندە بەسە کە ماڵی خودایە.
١١. ئەوەندە بەسە کە خۆشەویسترین زەوییە لای پەروەردگار.
١٢. یەکەم کاری پێغەمبەر ﷺ کە چوو بۆ مەدینە دروستکردنی مزگەوت بوو.
١٣. لە ئێستادا هەر چەند دەور و بواری مزگەوت کەمکراوەتەوە، بەڵام کاریگەری زۆر بەسەر کۆمەڵگەوە ماوە بەتایبەت لە ڕەمەزاناندا، دەکرێ کاری زیاتری لەسەر بکەین و بیکەینە وێستگەی گۆڕانکاری.

# فکرەی دوازدەیەم: لیژنەی مزگەوتەکان

دروستکردنی لیژنەی:

١. لیژنەی خەیری خێرخوازی.

٢. دەعەوی.

٣. لیژنەی پاکوخاوێنی بۆ مزگەوتەکان.

ئەم سێ لیژنەیە زۆر پێویستن بۆ مزگەوت.

## فكرەی سێزدەیەم: دەوری ئیمامە بەڕێزەكان لە ڕەمەزاندا

١. گرنگی هەرە گەورە ئیمامی مزگەوتە، دەبێ پێش ڕەمەزان بەرنامە و پلانی ڕەمەزان دانێ.
٢. دڵی زۆر یەكلا بكاتەوە بۆ خودا، چونكە شەرەفی ئەوەی پێ بڕاوە خزمەتكاری ماڵی خودا بێ، نابێ ئەوە بەكەم بزانێ.
٣. نابێ مزگەوت ئیهمال بكات و دووركەوێتەوە لە مزگەوت بەتایبەت لە ڕەمەزاندا.
٤. دەبێ لە مزگەوتدا بمێنێتەوە، بەتایبەت خەڵک لە ڕەمەزاندا زۆرترین پرسیاری هەیە.
٥. دەبێ ڕووخۆش بێ و نابێ بێزار بێ لە خەڵک، بەتایبەت لەگەڵ ئەوانەی تازە دێنە مزگەوت.
٦. ئیمام دەبێ زۆر بەپەرۆش بێ بۆ تەوبەكارەكان، لەوانەیە ڕووخۆشی و پێكەنین و دانیشتنی ئیمام لەگەڵ تەوبەكاران ژیانی ئەوان بگۆڕێ، وە بترسێ لەوەی ڕووگرژی و بێزاری ئەو ئەم گەنجە یان ئەم نوێژخوێنە لە مزگەوت بتۆرێنێ.
٧. ئیمام دەبێ گرنگی بە هەموو توێژەكانی خەڵک بدات و لەگەڵیان بژی.
٨. با ئیمام بزانێ ئەگەر لە ڕەمەزاندا سەركەوتوو بێ لە كاتەكان و كارەكانی دیكەشدا سەركەوتوو دەبێ.
٩. لە هەموو جێگەیەك خەڵكی عەجول و بێزاركەر هەیە، دەبێ چاوەڕوانی بكا بزانێ چۆن كاریگەری ئیجابی لەسەر دەبێ.

## فكرەی چواردەیەم: گرنگیدان بە ئیمامەت لە ڕێی بەکارهێنان و یارمەتی وەرگرتن لە قوڕئانخوێنە دەنگخۆشەکان

١. یەکێک لەو نیعمەتانەی خودای گەورە بە داودی بەخشی بوو دەنگی خۆش بوو، هەتا بەحەددێک دەنگخۆش بوو چیاکان و باڵندەکان لەگەڵ داوددا تەسبیحاتیان دەکرد و زەبوریان دەوتەوە: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ يَـٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ ﴾ سبأ: ١٠ ، واتا: سوێند بە خودا بەڕاستی لەلایەن خۆمانەوە بەهرەیەکی گەورەمان بە داوود بەخشی بوو، ئەی چیاکان و باڵندەکان لەگەڵ داوود زیکر و تەسبیح بڵێنەوە، وە ئاسنمان بۆ نەرم کردبوو.

٢. پێغەمبەری ئازیز ﷺ گرنگی بە دەنگی خۆش داوە خۆی زۆر دەنگخۆش بووە، بەڵکو خۆشترین دەنگی هەبووە.

٣. کاریگەری قورئان خوێندن: « عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ، فَلَمَّا بَلَغَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الطور: ٣٥، ﴿ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ الطور: ٣٦، ﴿ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ الطور: ٣٧، كَادَ قَلْبِي أَنْ يَطِيرَ ».[١] واتا: جوبەیری کوڕی موتعیم دەڵێ: کە پێغەمبەر ﷺ سوڕەتی (الطور)ی لە مەغریبدا خوێندووە دڵم خەریک بووە بفڕێ لە خۆشیان.

٤. کەسێک دەنگی خۆی خۆش نەکا لەسەر سوننەتی سەروەرمان ﷺ نییە: « عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ ". وَزَادَ غَيْرُهُ: يَجْهَرُ بِهِ ».[٢]

---

[١]- صحيح البخاري: ٤٨٥٤.

[٢]- صحيح البخاري: ٧٥٢٧.

٥. گەورەیی ئەو کەسانەی کە شارەزان لە قورئان خوێندن: « " الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ "، وَ: " زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ ».[١]

٦. ئیمام دەبێ هەوڵبدا کۆمەڵێک قورئانخوێن پەروەردە بکا، هەر کات خۆی لەوێ نەبوو جێگەی پڕ بکەنەوە بەتایبەت بۆ ڕەمەزان.

٧. واش لە خەڵک نەکەین کەسێک دەنگی خۆش نەبوو نوێژی لەدوا نەکەین، ئەمەش شتێکی خراپە، دەبێ خەڵک وا لێ بکەین بە دوای کەسی چاک و پارێزکاردا وێڵ بن، نەوەک تەنیا دەنگخۆش.

---

[١]- صحيح البخاري: ٧٥٤٤.

# فکرەی پازدەیەم: بۆ قورئانخوێنە ئازیزەکان

١. قورئان خوێندن عیبادەتێکی گەورەیە، دەیان ئایەت باسی گەورەیی قورئان و قورئانخوێن دەکەن.
٢. کاتێک خودای گەورە ئەو بەهرەیەی پێ بەخشیوی سوپاسگوزار بە، چونکە هەزاران کەس خۆزگە بە تۆ دەخوازن، بەڵام پێی نەگەیشتوون و بەم ئاواتە سەریان ناوەتەوە، بەڵام جەنابت پێی گەیشتووی شوکر بۆ خودا.
٣. قورئانخوێنەکان زوو دەناسرێن بەتایبەت دەنگخۆشەکان، بۆیە دەبێ زۆر ئاگایان لە ڕەوشتیان بێ.
٤. دەبێ ئاگامان لە ئیخلاص و یەکلابوونەوە بێ بۆ خودا، نابێ تەنیا گرنگی بە دەنگمان بدەین.
٥. دەبێ گرنگی تەواو بە دەنگمان بدەین هاوکات لەگەڵ بۆ خودا بوون.
٦. گەنجان زۆر بەتوانان، دەتوانن لاسایی چەندین قورئانخوێن بکەنەوە بۆ ئەوەی نوێژخوێنەکان بێزار نەبن.
٧. ئەگەر بکرێ زۆر گرنگە قورئانخوێن ئاوازی سەربەخۆی هەبێ، بۆئەوەی لە لاسایی خەڵکی دیکەدا نەتوێتەوە.
٨. فێربوونی مەقامات باشە بە مەرجێک زیان بە جوان خوێندنەوەی قورئان نەگەیەنێ و نەیباتە سەر ئاوازی گۆرانیبێژەکان.
٩. خۆیان بپارێزن لە حەسوودی، چونکە حەسوودی دەردێکی کوشندەیە.
١٠. ئەو کاتانەی کە بەڕۆژوو نین زوو زوو ئاو بخۆنەوە، بۆئەوەی تووشی گرفتی قورگ هێشان نەیەن.
١١. گرنگی بەوە بدەن ئێواران خواردنی زۆر نەخۆن لە ڕەمەزاندا، چونکە هەم تەقوا ناهێڵێ و هەم هەناسە.
١٢. قورئان خوێندن بۆ بازرگانی بەکار نەهێنین چونکە مەترسیدارە.
١٣. هەوڵ بدەن قیرائەی (حفص) باش فێربن، چونکە لە وڵاتی ئێمە ئەو قیرائەتە دەخوێندرێ.

١٤. نابێ لە کاتی پێشنوێژیدا تەنیا حیسابی خۆیان بکەن و خەڵکی دواى خۆیان هیلاک بکەن.
١٥. هەوڵ بدەن گۆڕانکاری بەسەر تۆن و ئاوازی خۆیاندا بێنن.
١٦. بۆ پێشنوێژی تەڕاویح ئەگەر قورئان بەکار بێنن ئاساییە و دروستە.
١٧. نابێ خەڵک بە دەنگی زۆر بەهێز بێزار بکەن، بەداخەوە ئەم دیاردەیە زۆرە، نزا بکەین قورئانی پیرۆز بەڵگە بێ بۆمان نەوەک لەسەرمان.

# فکرەی شازدەیەم: بۆ ئیمامە بەڕێزەکان

١. خودای گەورە فێرمان دەکا لەسەر زمانی بەندە ساڵحەکان ببینە ئیمام بۆ مسوڵمانان، کە تۆ پێی گەیشتووی شوکری خودا بکە و قەدری بزانە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾ الفرقان: ٧٤، واتا: وە کەسانێکن کە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ببەخشە پێمان لە هاوسەران و نەوەکانمان (منداڵەکانمان) ئەوەی چاوانی پێ گەش بێ و هۆی دڵخۆشی بێت، وە بمانکە بە پێشەوای پارێزکاران و لەخوداترسان.

٢. پێغەمبەرمان ﷺ نزای خێری بۆ ئیمامەکان کردووە: « عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " الْإِمَامُ ضَامِنٌ، وَالْمُؤَذِّنُ مُؤْتَمَنٌ، اللَّهُمَّ أَرْشِدِ الْأَئِمَّةَ وَاغْفِرْ لِلْمُؤَذِّنِينَ " ».[١] پێغەمبەری ئازیز ﷺ نزای سەرڕاستی بۆ ئیمامەکان کردووە، چونکە ئەگەر ئیمامەکان سەرڕاست بن، خەڵک سەرڕاست دەبێ و بزر نابێ.

٣. گرنگیدان بە هەموو جۆرەکانی بانگەوازی چ بە گوفتار چ بەڕەفتار، وە خۆ بۆ ئامادەکردن.

٤. گرنگیدانی تایبەت بە هەژاران، چونکە ئەوان زۆر دڵشکاو و بێزارن.

٥. گرنگیدانی زۆر بە مزگەوت بە دابینکردنی پێویستییەکانی.

٦. پەیوەندی باش بە ئەهلی گەڕەکەوە، نەوەک تەنیا نوێژخوێنان.

٧. بەسەرکردنەوەی ئەوانەی نەخۆش و خەمبارن.

٨. ئاگاداربوون لە حاڵی هەژارەکانی گەڕەک و بەسەرکردنەوەیان.

٩. هەڵمەی خاوێنکردنەوەی مزگەوت و دەوروبەری.

١٠. پەیداکردنی دڵسۆزانی زۆر بۆ مزگەوت، وە گوێگرتن بۆ پێشنیارەکانیان، بۆئەوەی تەنیا خۆی خەمخۆری مزگەوت نەبێ.

---

١- سنن أبي داود: ٥١٧.

١١. بەجێ نەهێشتنی مزگەوت بەبێ پێویستی، وە خۆگرتنەوە لە سەفەر و ئەملا و ئەولا.

١٢. جێبەجێکردنی سوننەت لە مزگەوتدا، بۆئەوەی نوێژخوێنەکان بە تیۆری و کردەیی فێری سوننەت بن.

١٣. ئیمام هەوڵ بدا پێش خەڵک لە مزگەوت بێ، بەتایبەت ئەگەر کەس نەبێ بە غەیری ئەو دەرگای مزگەوت بکاتەوە.

١٤. ئەگەر بزانێ کەلێنی گەورە دروست دەبێ لە مزگەوتەکەی لە ڕەمەزاندا عەمرە نەکات، بەڵکو بیخاتە کاتی غەیری ڕەمەزانەوە.

١٥. ئیمام بە هەیئەت و پۆشاکی جوان و بۆنی خۆشەوە دەرکەوێ.

١٦. دەبێ ئیمام زۆر بەئارامی ڕەفتار بکا و هەڵنەچێ و جوێن و وتەی ناشیرین بەکار نەهێنێ.

١٧. ئیمام دەتوانێ گرنگی تەواو بە مزگەوت و خەڵکەکەی بدا و بیکاتە ڕەمەزانێکی جیاواز.

١٨. هەوڵ بدەین تەڕاویحێکی سوننەتانە و بەرهەمدار ئەنجام بدەین.

ئەوانەی کە باسمان کردن تەنیا چەند ڕێنماییەکی کورتە، دەنا دەبێ ئیمامەکان زۆر گرنگی بە کار و پیشەی خۆی بدا و خۆی ڕۆشنبیر بکا.

## فکرەی حەڤدەیەم: تەوبەی کچێکی تەوبەکار لە دەڤەری ڕاپەڕین

تەوبەی کچێکی کورد خودای گەورە لێی قبووڵ بکا کە پێشتر باڵاپۆش نەبووە شەڕی شەیتان. . شەڕی نەفس. . دەریایەك فرمێسك

لەپێناو دەستخستنی باڵاپۆشی (حیجاب) بەدەستهێنانی ڕەزامەندی مەحبوبەکەم (خالقەکەم)

مرۆڤ زۆر لەوە گەورەتر و بەتواناترە کە هەستی پێ دەکرێت، بۆ ئەمەش پێویستی بە ڕوناکییەکە تا پێش چاوی خۆی ببینێت بۆ کارەکانی و سەلماندنی ئەم ڕاستییە.

من ئەو کچە ژیکەڵانە بووم کە هەر لە تەمەنی منداڵیم گوێم بۆ هەموو بابەتێکی ئایینی و ئامۆژگاری دینی دەگرت، ئاشقی خودا و پیغەمبەرەکەی ﷺ بووم. لەگەڵ هەڵکشانی تەمەن زیاتر و زیاتر ئاشق دەبووم، بەڵام بێخەبەر لەوەی ئەوان چیان لە من دەوێت، کاتێ تێگەیشتم درەنگ بوو بوو تەمەن باڵای کردبوو لق و پۆپی بیرکردنەوەکانم زبر ببوون، دڵم یەك پارچە ئازار بوو و دەستی نابووە گەردنمەوە تاو نا تاوێ خەریك دەبوو دەیخنکاندم، بە هەرحال بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ لای خودا، هەر جارێك ویستبام شەیتان دەهاتە سەر ڕێگەم و بە جۆرێك لە جۆرەکان پەشیمانی دەکردمەوە، وە نەبێ بە ئاسوودەیی، بەڵکو بە گریانەوە دەگەڕامەوە ئەو شوێنەی لێوەی دەهاتم، جارێك، دووان، سیان . . . هتد، ساڵێك دوو ساڵ بە حەقەت سێ ساڵی خایاند لەو ڕێگەیە شەکەت و ماندوو ببووم، کەسێك نەبوو دەستم بگرێت و فرمێسکێکم بۆ بسڕێت، ئومێدێکم پێ ببەخشێت، هێزێکم بەبەردابکات، ئەوەی کە ئازاری دەدام ئەوە بوو تەنانەت هاوپۆلەکانیشم لە دەرەوە سڵاویان لێ نەدەکردم، پێیان وا بوو من ڕقم لە خودایە، بێئاگا بوون لەوەی کە تەنها لاشەم لای ئەوانە و ڕووحی من لەبەر دەرکی خودا کەوتووە و هەمیشە چاوەڕێی وەڵامێکی پەروەرێنەکەم بووم بە ڕووحمدا ڕەوانەی بکات، ئاخۆ حاڵی جەستەی بێڕووح چۆن بێت ڕووح لە ئاسمان و خۆم لەسەر زەوی بە ڕۆژ خەیاڵات و بە شەو موناجات فرمێسك تەواوی بەرماڵەکەمی تەڕدەکرد، تا کار دەگەیشتە ئەوەی بە گریانەوە دەم وت: خودایە خۆ

من ئیمانم بە تۆیە، دە جوابم بدەوە، خودا بەهۆی حیکمەتە تایبەتییەکانی لێی دوا دەخستم، تا وای لێهات ڕۆژێك بچمە پێش دەرگای هاوڕێیەکم کە باڵاپۆش بوو، پێی بڵێم: هاتووم لەسەر دەستی تۆ حیجاب دەکەم، تاوەکو هیچ نەبێت بەهۆی ئەو شەرم دامبگرێت و نەتوانم وازی لێ بهێنم، دیسان قەدەری خودا وا بوو هاوڕێکەم لە ماڵ نەبوو، وتم: کە هاتەوە پێی بڵێن: فلانە هاوڕێیەت هاتووە کاری گرنگی پێت بووە کە بۆی ڕەخسا ب ائاگادارم بکاتەوە، زۆر چاوەڕوانم کرد هیچ هەواڵێکی نەبوو، تا شەوێك کە ٢٩ی ڕەمەزان بوو لە خەومدا خودا پێغەمبەری ئەزیز و خۆشەویستی ﷺ بۆ ناردم هەزاران جار ڕووحم فیدای بێت، لە چەند چرکە ساتێکی تەنها شەوێکدا وەڵامی ئەو هەموو ناسۆرییانەی دامەوە کە ساڵانێك بەدوایدا وێڵ بووم، خودی خۆشی بۆ من مژدانەیەك بوو کە تا مردن بیرم ناچێت، ئەو شەوە لە خەومدا لە گۆڕەپانێك بووم لەگەڵ هاوڕێیەکم لەپڕ گوێم لە دەنگێك بوو، وتیان: ئەوە پێغەمبەرە ﷺ، لە جێی خۆم هەڵوەستەیەکم کرد و وتم: خۆ من دەمەوێت لەسەر دەستی کەسێك تەوبە بکەم، بۆ نەچم لەسەر دەستی ئەو تەوبەکە نەکەم، ئەوە بوو خێرا و بەپەلە ڕۆیشتم تا گەیشتم بە دیداری موبارەکی، مرۆڤێکی تا بڵێی نەرمونیان و لەسەرخۆ بوو، هەواڵەکەم پێ گەیاند و کەمێك قسەمان کرد لەسەر بابەتی تەوبەکە، کە کۆتایی هات سوێند بەو خودایەی گیانی هەموومانی بەدەستە پێغەمبەر ﷺ هەر دوو دەستی پیرۆزی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و فەرمووی: الحمدلله الحمدلله، زۆر سوپاس بۆ تۆ خودایە گیان. ئەوە چیرۆکی تەوبەکردنی من بوو زۆر بەکورتی ئەگەرنا ئازاری زۆر و زیاتری لەخۆگرتبوو.

**تێبینی:** من خاوەن دڵێکی پڕ نوور و ئیمان و تەقوا بووم، ئەوەی کە فەرامۆشم کردبوو تەنها ئەو ئایەتانە بوون کە باسیان لە حیجاب دەکرد، کەواتا تۆی ئیماندار لە پیاوان و ئافرەتان ئەگەر ئایەتێکتان فەرامۆش کردووە یا حەزی پێ ناکەن بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆتان، پێویستە موراجەعەیەکی نەفسی خۆتان بکەن و پەشیمان ببنەوە، ئایەت هەر ئایەتە چ بۆ حیجاب بێت یان هەر شتێکی دیکە.

خودا لە هەڵە و تاوانی هەمووان خۆش بێت.

## فکرەی هەژدەیەم: دروستکردنی سەللەیەکی خواردەمەنی

١. هەر لە پێش ڕەمەزانەوە سەللەی خواردەمەنی ئامادە بکرێ بۆ ئەو کەسانەی کە هەژارن، بۆئەوەی پارشێو و بەربانگەکەیان بەدڵخۆشی بکەنەوە.
٢. بۆ ئەم کارە خوداپێداوەکان ئاگادار بکرێنەوە و هان بدرێن بۆئەوەی هاوکار بن.
٣. ئەم خواردنە لە شوێنی جوملە ئامادە بکرێ، بۆئەوەی زۆرترین خواردن ئامادە بکرێ.
٤. هەوڵ بدرێ سەللەکە ئەو خواردەمەنییانەی تێدا بێ کە بۆ ڕۆژانە پێویستن، ئەگەر گۆشتی بۆ زیاد بکرێ زۆر باش دەبێ.
٥. سەللەکە ئەگەر بکرێ بایی دە ڕۆژی خواردن تێدا بێ زۆر باشە.
٦. ئەگەر بکرێ با بەنهێنی و بە شەو بۆ ماڵەکان ببردرێ.
٧. بەڵام با سفرەی جەژن جیاواز بێ و شتی جێژنانەشی پێوە زیاد بکرێ.
٨. دەکرێ پارەی سەرفیترە بۆ ئەم مەبەستە بەکار بهێنرێ.
٩. با لیژنەیەک بەم کارە هەڵبستێ.
١٠. بتوانرێ سەرژمێری هەژارەکان بکرێ لەو گەڕەکەی کە مزگەوتەکەی لێیە.
١١. بەم کارە خێرییە مزگەوت و مسوڵمان دەبێتە ڕەحمەتی تەواو بۆ خەڵکی گەڕەک.
١٢. دەکرێ بابەتەکە دەوڵەمەند بکرێ بە پرسکردن بە دڵسۆزان.

# فکرەی نۆزدەیەم: وتاری جومعە

بابەتەکانی جومعە لە ڕەمەزاندا ئەو بابەتانە لەخۆ بگرێ:

١. فەلسەفە و حیکمەتی ڕەمەزان و پێشوازی لە ڕەمەزان.
٢. بەشێک لە ئەحکامەکانی ڕۆژوو و تەوبەکردن.
٣. باسی زەکات و زەکاتی فیترِ.
٤. باسی شەوانی قەدر و گەورەیی ئەو شەوانە و چۆن تەوزیعیان بکەین بە کاری خێر.
٥. باسی جەژن و فەلسەفەی جەژن و ئادابەکانی جەژن.

## فكرەی بیستەم: دەوری ئافرەت لە ڕەمەزاندا

سەرەتا پێگەی ئافرەت:

١. ئافرەت مرۆڤە و مرۆڤیش ڕێزلێگیراوە: ﴿ ۞ وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّمَّنۡ خَلَقۡنَا تَفۡضِيلٗا ٧٠ ﴾ الإسراء: ٧٠، واتا: سوێند بە خودا بێگومان ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرت و لە وشكانی و لە دەریادا هەڵمان گرتن (بە سواری و گەڕاندمانن) و ڕۆزی پاك و خاوێنمان پێ داون، وە باومان داون بەسەر زۆرێك لەو شتانەی كە دروستمان كردوون بە باودانێكی گەورە.

٢. لە ڕووی تەكلیف و ڕێز و پاداشتەوە جیاوازی نییە لە نێوان نێر و مێدا: ﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ١٩٥ ﴾ آل عمران: ١٩٥، واتا: ئینجا پەروەردگاریان وەڵامی (نزاكانی) دانەوە، (فەرمووی:) بێگومان من زایە ناكەم كردەوەی (هیچ) خاوەن كردەوەیەک لە ئێوە لە نێر یان مێ، هەندێكتان لە هەندێكی دیكەتان بوون، جا ئەوانەی كە كۆچیان كرد و دەركران لە جێ و شوێنی خۆیان و ئەشكەنجە و ئازار دران لە ڕێی مندا و جەنگیان كرد و كوژران سوێند بە خودا دەسڕمەوە لێیان خراپەكانیان، وە بێگومان دەیان خەمە بەهەشتانێكەوە كە ڕووبارەكان دێن و دەچن بەژێریاندا، ئەمە پاداشت دانەوەیەكە لە لای خوداوە، وە لای خودایە جوانترین (چاكترین) پاداشت.

٣. ئەگەر هەر شانازییەک هەبێ بۆ پیاو دەگەڕێتەوە بۆ ئافرەت، چونكە مامۆستای یەكەمی هەر كەس دایكە.

٤. ئەم وتەیە زۆر ڕاستە: لە پشت پیاوە گەورەکان بەردەوام ئافرەتی گەورە بوونی هەیە.
٥. منداڵەکان لە هەر کەس زیاتر بە دایکیان کاریگەرن بەتایبەت کچان، وەک بڵێی: زۆربەی کات کۆپی دایکیانن مەگەر بە شاز نەبێ.
٦. پیاوان هەر چەند بەهێز بووبن لە بەرانبەر ئافرەتاندا نەرم بوون و لەژێر کاریگەری ئەواندا بوون، زۆر لە پیاوان دەسەڵاتدار و دڕندە بوون، بەڵام لە بەرانبەر خێزانەکانیان نەرم بوون، ئەگەر مێژوو بخوێنییەوە سەرت دەسوڕمێ.
٧. فیرعەون بڕیاری یەکلاکەرەوەی دابوو بە سەربڕینی نێرینەکان، بەڵام کە ئاسیەی خێزانی وتی: موسا مەکوژە، نەیکوشت.
٨. مێژوو قەد ناتوانێ مەریەم و ئاسیە و عائیشە و ئەلیزابێت و وێنەی ئەوانە لە بیر بکا.
٩. گەورەترین مەخلوق ڕەسول الله ﷺ دەبینین گەورەترین پشتیوانی خەدیجەی خێزانی بووە لە کاتە هەرە سەختەکان.
١٠. ئەگەر حەوا نەبا ئادەم بە تەنیا کۆتایی پێ دەهات و ژیان کۆتایی پێ دەهات.
١١. هەموو ئەو شتانەی کە بە ناوی دینەوە ئافرەتی پێ تاوانبار دەکرێ، یان دین نییە یان حاڵی نەبوونە لە دین.
١٢. ئافرەت بەپێی مێژووی دینی و مێژوی ئیسلامی لە هەموو کایەیەک بەشدار بووە.
١٣. لە مێژووی ئیسلامدا لە هەموو بوارەکانی زانستی بەشدار بووە، یەک بواریش نەبووە تێیدا بەشدار نەبووبێ، ئەمە بەتەحەدداوە دەڵێم.
١٤. لە ئێستادا ئافرەتان زۆرترین خزمەت بە ئیسلام دەکەن شوکر بۆ خودا.
١٥. زۆرترین ڕێژە لە ئەوروپا ئافرەتانن مسوڵمان دەبن.
١٦. هیچ کات پیاو ناتوانێ جێگەی ئافرەت پڕ بکاتەوە، هەر وەک چۆن ئافرەتیش ئەو کارەی پێ ناکرێ.
١٧. ژن و پیاو کارەکەیان تەواوکارییە، نەوەک لە یەکدی یاخیبوون، وەک جووڵانەوە فیمینزمییەکان دەڵێن و هەوڵی بۆ دەدەن.
١٨. لە ئێستادا زیاتر لە سێزدە وڵات ئافرەت سەرۆکایەتی دەکات.
١٩. ئافرەت دەتوانێ کاری سیاسی بکات و ببێتە سەرۆک و دادوەر و کاندید و زانا و داهێنەر و ... هتد.

## فکرەی بیست و یەکەم: ئافرەت و مزگەوت

١. خودای گەورەکە باسی مەریەم دەکا، ئەو کەسێک بووە سەرەتا خودای گەورە ئەم نزایەی لە دایکی قبووڵ کرد بۆئەوەی خزمەتکاری دینی خودا بێ، دایکی دەیویست کوڕ بێ، بەڵام خودای گەورە ویستی ئافرەت بێ، چونکە لەم مەقامەدا کوڕ دەوری ئەوی پێ نەدەبینرا: ﴿ إِذۡ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ عِمۡرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرۡتُ لَكَ مَا فِي بَطۡنِي مُحَرَّرٗا فَتَقَبَّلۡ مِنِّيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٣٥ ﴾ آل عمران: ٣٥، واتا: بێنەوە بیر کاتێک کە ژنی عیمڕان وتی: ئەی پەروەردگارم بێگومان من نەزرم کردووە بۆ تۆ ئەوەی کە لە سکمدایە ئازادکراو بێت (بۆ خزمەتی خانەی تۆ کە بیت المقدسە)، دە تۆش (ئەم نەزرەم) لێ گیرا بکە، بەڕاستی تۆ بیسەری زانایت: ﴿ فَلَمَّا وَضَعَتۡهَا قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا وَضَعَتۡ وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰۖ وَإِنِّي سَمَّيۡتُهَا مَرۡيَمَ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ٣٦ ﴾ آل عمران: ٣٦، واتا: جا کاتێک کە سکەکەی دانا، وتی: ئەی پەروەردگارم خۆ من کچم بوو، بەڕاستی خودا زاناترە بەوەی کە بوویەتی، کوڕیش وەک کچ نییە، وە بێگومان منیش ناوم نا مەریەم، وە من خۆی و نەوەی دەپارێزم بە تۆ لە شەیتانی دەرکراو.

٢. ئەو ئەو کەسە بوو نەوەک هەر بۆی نییە خزمەتی ماڵی خودا بکا وەک یاسای کەهەنی دانابوو، بەڵکو بە قورعە بەریان کەوت تا کێ بتوانێ کەفالە و پەروەردەی مەریەم بکات.

٣. مەریەم شوێنێکی تایبەتی هەبوو لە مزگەوتی ئەقصادا کە تێیدا خوداپەرستی دەکرد: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ١٦ ﴾ مریم: ١٦، واتا: ئەی موحەممەد ﷺ باسی بەسەرهاتی مەریەم بکە لە قورئاندا ئەو کاتەی کە

کەنارگیری کرد لە کەسوکاری لە شوێنێکی ڕۆژهەڵاتی (مزگەوتی قودسدا خوداپەرستی) دەکرد.

٤. مەریەم ئەوەندە ئافرەتێکی سەرکەوتوو بوو کە خزمەتی مزگەوتی دەکرد، زەکریا لە ئەزرەت و تەقوای ئەو حەزی چۆ سەر منداڵ و داوای منداڵی کرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە تەمەنی تێپەڕیبوو و خێزانەکەشی نەزۆک بوو: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥۖ قَالَ رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةٗ طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ٣٨﴾ آل عمران: ٣٨، واتا: ئا لەو کاتەدا زەکەریا لە پەروەردگاری پاڕایەوە و وتی: ئەی پەروەردگارم پێم ببەخشە لە لایەنی خۆتەوە کوڕێکی سروشتپاک، بەڕاستی تۆ بیسەری پاڕانەوەیت.

٥. مەریەم بوو بە دایکی یەکێك لەو پێغەمبەرانە کە لە دنیادا زۆرترینی ڕەها خۆیان بە شوێنکەوتووی ئەو دەزانن.

٦. هاجەرە ئەو کەسە بووە لە بەرەکەتی ئەو بۆ هەتا هەتایە ئەم کەعبە ڕێزدارە ناو و ناوبانگی پەیدا کردووە.

٧. یەکێک لە گەورەترینی پێغەمبەران دوای محمد و ئیبراهیم موسایە ﷺ کە یەکەم پشتیوانی و هۆکاری سەرکەوتنەکەی دوای پەروەردگار ئافرەت بوو.

٨. لە سەرەتای ئەو بانگەوازی ئیسلامە ئافرەت یەکەم کەس بووە ئیمانی بەم دینە هێناوە.

٩. ئافرەت یەکەم کەس بووە لەپێناوی ئەم دینە شەهید بووە.

١٠. لە سەردەمی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ ئافرەتان بەشداری کارایان بووە لە مزگەوتدا، هەتا لە نوێژی بەیانی و خەوتناندا بەشدارییان هەبووە.

١١. لە چەندین فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ ئاگاداری کردووینەوە کە ئافرەتان لەماڵەکانی خودا مەنع نەکەین و ڕێگر نەبین.

١٢. زۆر کەس پێی وایە ئافرەت لە ماڵەوە بێ خێرترە لەبەر ئەم فەرموودەیە: « قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " لَا تَمْنَعُوا نِسَاءَكُمُ الْمَسَاجِدَ، وَبُيُوتُهُنَّ خَيْرٌ لَهُنَّ " »[١] ئەم خێر و باشییەتە ڕەها نییە و لە هەموو لایەکەوە نییە، بەڵکو لە زۆر لاوە مزگەوت باشترە، با لە یەک دوو لایەن ماڵ باشتر بێ، چونکە ئافرەت لە مزگەوت لە دین شارەزا دەبێ، فێری ئادابەکان دەبێ، یەکدی ناسین دروست دەبێ، پرسیار لە ئافرەتانی شارەزا دەکا،

---

١- سنن أبي داود: ٥٣٥.



دڵی بە ئیسلام خۆش دەبێ، بەڵام مانای ئەوە نییە هەر بێنە مزگەوت و بەس، بەڵکو پێویستییان بە ڕێکخستن و هاندان و شارەزاکردن و ڕۆڵپێگێڕان هەیە.

١٣. بۆیە هەوڵ بدرێ لە مزگەوت گرنگی تایبەتییان پێ بدرێ.

١٤. شوێنی تایبەتییان لە مزگەوتەکان بۆ دروست بکرێ بە تەواوی موراڤیق و پێویستییەکانی تریش.

١٥. ئەو خێرخوازانەی کە مزگەوت دروست دەکەن تەواو حیسابی منداڵ و ئافرەتان بکەن.

١٦. با ئافرەتان لە مزگەوتەکان سەرپەرشتیکاریان لە خۆیان بۆ دابنرێ.

١٧. کلیلی بەشەکەی خۆیان پێ بسپێردرێ بۆئەوەی هەست بەتەواوی بەرپرسیارییەتی بکەن.

١٨. ئەڵقەی دەرسیان هەبێ هەم گشتی و هەم تایبەتی.

١٩. هەوڵ بدەین داعی لە خۆیان پەروەردە بکەین و هان بدرێن بۆ خێر و خێرات.

٢٠. بابەتە کۆمەڵایەتییەکانیان بەچڕی لەگەڵ باس بکرێ، چونکە بۆ خۆیان زۆر گرنگی پێ دەدەن.

٢١. ئافرەتانیش دەبێ هاوسەنگی ڕابگرن لە نێوان ئەرکیماڵەوە و چوونە مزگەوت، لەوانەیە نەتوانن بۆ مەغریب بەشدار بن، بەڵام دەتوانن بۆ نوێژی عیشا و کاتەکانی دیکە بەشدار بن.

٢٢. نابێ لە ماڵەوە منداڵی بچووک یان ئاگر یان شتی مەترسیدار جێ بێڵن.

٢٣. نابێ نەخۆشێک یان بەساڵاچووێک بەجێ بێڵن کە پێویستی بە ئەوان بێ.

٢٤. هیوادارین ئەم ساڵ زیاد لە هەر کات گرنگی پێ بدەین بەتایبەت لە ڕووی ئافرەتان.

## فکرەی بیست و دووەم: خوشکان و خۆڕاگری لەسەر دین

١. یەکتاپەرستی بە شێوازە ڕاست و دروستەکەی باشترین هۆکاری خۆڕاگرییە، ئەو خوشکەی خودا بناسێ و خۆشی بوێ و شەرمی لێ بکا، وە بزانێ چاکە لە خودا نزیکی دەخاتەوە و خراپە دووری دەخاتەوە، حەتمەن پابەند دەبێ.

٢. یەکێک لە هۆکارەکانی بەردەوامی لەسەر دین ئاگاداربوون لە قورئانە، وەک:

- جوان خوێندنی قورئان.
- تێگەیشتن لە قورئان.
- جێبەجێکردنی قورئان.
- گەیاندنی قورئان.
- بەرگریلێکردنی قورئان.

٣. ناسینی پێغەمبەری ئازیز ﷺ، چونکە سەرکەوتووترین مرۆڤ بووە لە ژیاندا لە هەموو بوارەکان.

٤. شارەزابوون لە ژیانی ناودارانی ئیسلام بەتایبەت ئافرەتان.

٥. شارەزابوون لە پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا.

٦. شارەزابوونی لە مافەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا.

٧. شارەزابوون لەو پیلانانەی کە دژی ئیسلام دەیگێڕن.

٨. ناسینی جووڵانەوە فیمینیزمییەکان، ئەوانەی دەیانەوێ ئافرەت لە پیاو یاخی بکەن، نەوەک ببێتە هاوکار و تەواوکار.

٩. ئاگاداربوون لە ژیانی نوێی موسوڵمانەکان، بەتایبەت ئافرەتان ژیانیان زۆر کاریگەرە.

١٠. هاوڕێیەتیکردنی کەسە پابەندیو زیرەکەکان.

١١. پەیوەندیکردن بەو ڕیکخراو و نێوەندانەی کە زانیاری گرنگ فێری ئافرەت دەکەن و دەستی دەگرن بەرەو سەرکەوتن.

١٢. ئاگاداربوون لە پەیج و تۆرەکۆمەڵایەتییەکان، بەگشتی زۆر کەم بەکار بهێنرێ، وە ئەگەر بەکاریشت هێنا لەگەڵ شتی باش خۆی سەرقاڵ بکا.



١٣. هەوڵ بدا خۆڕاگر بێ لە بەرانبەر تانە و تەشەری ناحاڵی و بێدینەکان.
١٤. نزا و پاڕانەوە لەبیر نەکەی بۆ بەردەوام بوون.
١٥. گرنگیدان بە چیرۆکە قورئانییەکان.
١٦. فێربوونی زانستی شەرعی.
١٧. بانگەوازی هۆکاری فێربوون و بەردەوامییە.
١٨. با ئامانجت دیار بێ و بەجدی کاری بۆ بکە.
١٩. ڕەمەزان بکە بە فرسەت بۆ بەردەوامی و ڕووحی خۆ بەهێزکردن.
٢٠. سەردانی مزگەوت لە ڕەمەزاندا زیاتر بەهێزت دەکا.
٢١. بێسەروبەری هەندێک کەس ساردت نەکاتەوە.
٢٢. تۆ نموونە هەرە جوانەکە بە، نەوەک تەماشای ناموڵتەزیمەکان بکەی.
٢٣. کاتی خۆت بە شتی بێهوودە سەرف مەکە، کەسێک بەتەمای گەورایەتی بێ دەبێ شەونخوونی بچێژێ.
٢٤. متمانەت زۆر بە خۆت و بە دینەکەت بێ، دڵنیا بە سەرکەوتنی حەقیقی هەر بۆ ئەم دینەیە.
٢٥. بیرکردنەوە لە قیامەت و مردن پابەندی باش بۆ مرۆڤ دروست دەکا.
٢٦. لەبەرچاوگرتنی خۆشییەکانی بەهەشت و ڕەزامەندی خودا ئازار و میحنەت سووک و ئاسان دەکا.
٢٧. بەردەوام بیرکردنەوە لە ئاسیە و مەریەم و خەدیجە بۆئەوەی لای خودا ناو و ناوبانگت هەبێ.
٢٨. خۆسەرقاڵکردن بە کارێکی گونجاو، ئەگەر دەوام و کاری دیاریکراوت نەبوو.
٢٩. دەبێ بزانی خزمەتی ئەم دینە و قوربانیدان بۆی ئەرکی تۆشە، هاوکاری باشی خانەوادە و خێزانەکەت بە.
٣٠. نموونەی جوان بە بۆ دایک و باب و هاوسەر و هاوڕێ و هاوپیشەکانت.
٣١. هەموو ئەم بابەتانە و زیاتریش دەکرێ لە بەرنامەکانی ڕەمەزان خوشکە بانگخوازەکان کاری لەسەر بکەن.

## فکرەی بیست و سێیەم: ئافرەتان پەروەدەکاری پیاوە گەورەکانن

١. زوبەیری کوڕی عەوام لە باوەشی دایکێکدا پەروەردە بوو کە پێی دەوترا: سەفیەی کچی عەبدو لموطەلیب پوری پێغەمبەر ﷺ، ئەو زوبەیرەی کە عومەری کوڕی خەطاب بەرانبەر هەزار کەسی دانابوو لە شەڕدا، ئەو زوبەیرە پەروەردەی صەفیە بوو رضي الله عنهم.

٢. ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صدیق خێزانی هەمان زوبەیر رضي الله عنهم کە باسمان کرد لە ژیانیدا خزمەتێکی زۆری بە ئیسلام و موسوڵمانان کرد، لە کاتێکدا کە عەبدوڵلای کوری بە دارا هەڵواسرا، حەجاج چاوی لەوە بوو ئەسماء لێی بپاڕێتەوە، بەڵام هەر حیسابی بۆ حەجاج نەکرد و داوای نەکرد هەڵی نەواسێ.

٣. پێشتر عەبدوڵلای کوڕی پرسی پێکرد، وتی: دایکە خەڵک پشتی تێکردووم ئایا خۆم تەسلیمی حەجاج بکەم یان جەنگ بکەم؟ وتی: کوڕەکەم خۆت شارەزای بە حاڵی خۆت، ئەگەر دەزانی لەسەر حەقی تەنازول مەکە، ئەگەر خۆشت پێ حەق نییە واز بێنە.

٤. ئوممو عەمارە لە غەزوەی ئوحوددا کە بینی موسوڵمانان شکستیان هێنا، تاوی دا شیرەکەی دەورەی پێغەمبەری خودای ﷺ گرت، بۆئەوەی کافرەکان پێی نەگەن، لەم جەنگەدا زیاتر لە دوازدە برینی تێ بوو، هەتا ساڵێک برینەکانی تیمار دەکرد، وە لە غەزوەی حونەیندا لەو کەسانە بوو کە مەیدانی چۆڵ نەکرد.

٥. خەنسا شیعر و هاواری بۆ صەخری برای دنیای پڕکردبوو، بەڵام لە کاتێک ئیمانی هێنا لە غەزوەی ئوحوددا دوو برا و باوکی و مێردەکەی شەهید بوو هاواری نەکرد، بەڵکو دەیوت: ئایا پێغەمبەری خودا ﷺ سەلامەتە؟ ئەمە بەهۆی ئەوە بوو کە کەسایەتی خۆی بە ئیسلام دارڕشتبۆوە، بەڕاستی پەروەردەی ئیسلامی موعجیزە دروست دەکا.

٦. لە مێژوودا دەوترێ: کاتێک عومەری کوڕی خەطاب خەلیفە بووە مەنعی کرد کە شیر تێکەڵی ئاو بکرێ، ئافرەتێک ویستی ئەوە بکا، بەڵام کچەکەی نەیهێشت و وتی:



نەتبیستووە کە عومەر خەلیفەی موسوڵمانان مەنعی کردووە؟! وتی: جا عومەر ئاگادار نییە، وتی: ئەی خودای عومەر ئاگادار نییە؟ ئەم کچە لەخوداترسە دواتر بوو بە دایکی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کە بە دوو ساڵ و چەند مانگێک دنیای ئیسلامی پڕکرد لە دادگەری.

٧. عەبدوڵڵای کوڕی موبارەک دەڵێ: لەسەر زەوی لە سوفیانی ثەوری زیرەکتر نییە، مەبەستی پێ زەمانی خۆیەتی، ئەو سوفیانە داکی پێی وت: ڕۆڵە تۆ بخوێنە ژیانت لەسەر من، من کەفالەتت دەکەم، دواتر سوفیان بوو بە ئەو زانا بەرزە.

٨. ئیمامی ئەوزاعی کە دنیا شانازی پێوە دەکا پەروەردەی دەستی دایکی بوو.

٩. ئیمامی ئەحمەد دەفەرمووێ: ئیمامی شافیعی وەک ڕۆژە، ئایا کەس هەیە پێویستی بە ڕۆژ نەبێ، ئیمامی شافیعی باوکی زوو وەفاتی کردووە و دایکی پەروەردەی کردووە.

١٠. ئیمامی ئەحمەد هەتیو بووە و دایکی پەروەردەی کردووە.

١١. ئیمامی بوخاری باوکی زوو مردووە و دایکی پەروەردەی کردووە.

به هەزاران نموونەمان هەیە لەسەر ئەوەی کە ئافرەتان مامۆستا و پەروەردەکاری زانا هەرە گەورەکانی مرۆڤایەتی بوون، دەکرێ لە ڕەمەزاناندا کۆڕ و دانیشتنەکانمان بە ژیانی ئەم شۆڕەژن و شێرەژنانە بڕازێنینەوە.

# فکرەی بیست و چوارەم: گرنگیدان بە منداڵ

١. منداڵ نیعمەتێکی گەورەی پەروەردگارە بۆ ئەو کەسەی کە خودای پەروەردگار پێی بەخشیوە، ئەوەش کە خودای گەورە پێی نەبەخشیوە با نزا بکات و هەوڵی بۆ بدات، ئەگەر هەر نەبوو با ئارام بگرێ، دیارە بۆ دین و دنیای ئەو وا باشە خودای گەورە بەوە تاقی کردۆتەوە، دەبێ سەبری هەبێ بۆئەوەی ببێتە خاوەنی گەورەترین پاداشت لە دنیا و دوارۆژدا.

٢. لە کۆمەڵگەی ئێمە منداڵ ڕێژەکەی زۆرە و بەرچاوە، هەتا بەپێی داتاکان منداڵ لە (٪ ٣٠) زیاتری کۆمەڵگەی ئێمە پێکدێنێ، بۆیە دەبێ گرنگی تەواوی پێ بدرێ.

٣. پەروەردەی منداڵ لای ئێمە بەزەحمەتترە، چونکە فەلسەفەی فێرکردن و پەروەردەکردن بەشێوەیەکی تەندروست دانەڕژاوە.

٤. لە وڵاتی ئێمە بەرپرسەکان بە خوێندنگەی ئەهلی پەکی خوێندنگەی حکومییان خستووە تەنیا بە مەبەستی بازرگانی.

٥. دەوری دین کەمکراوەتەوە، بەڵکو تەواو پەراوێزکراوە.

٦. ڕێکخراوەکان ناتوانن ئەم کەلێنە پڕ بکەنەوە، چونکە بەشێک لەوانیش بۆ نەهێشتنی ڕەوشتە.

٧. هاندان بۆ منداڵ نییە و پرۆسەکە بەدادگەری بەڕێوە ناچێ.

٨. منداڵ کەمترین شت دەربارەی دینەکەی و شارستانییەتەکەی فێر دەبێ.

٩. منداڵ لە سەرەتاوە سەرسام دەکرێ بە فکرە و ڕەوشت و شارستانی بێگانە.

١٠. میدیا زۆربەی کات بۆ هەڵتەکاندنی خێزانە.

١١. تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بێسانسۆر هاتوونەتە ماڵەکانمان.

١٢. بواری زۆربەی خێزانی ئێمە لە ڕووی داراییەوە باش نییە، لەبەر ئەوە بەشێک لە منداڵان ناچارکراون بە کارکردن.

١٣. بۆیە دەبێ ئێمە گرنگی تەواو بە منداڵەکانمان بدەین و ڕەمەزان بقۆزینەوە بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانمان.

## فکرەی بیست و پێنجەم: بۆچی منداڵ تووشی لادان دەبێ؟

١. یەکێک لە دیارترین هۆکارەکانی لادانی منداڵ بریتییە لە پەروەردەی شکستخواردوو.
٢. هەژاری.
٣. گرفتی نێوان دایک و باوک.
٤. جیابوونەوەی دایک و باوک.
٥. هاوڕێی خراپ.
٦. تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان.
٧. کەناڵە ئاسمانییەکان.
٨. پڕ نەکردنەوەی کات بە کاری باش و بەسوود.
٩. خراپ مامەڵەکردنی باوک و دایک، وەک ئەوەی کە لەگەڵیدا زیاد لە پێویست توند بن.
١٠. لاساییکردنەوەی هاوڕێ خراپەکان.
١١. برای گەورە یان خوشکی گەورە ئەگەر لادەر (منحرف) بوون.
١٢. چاودێری نەکردن لە ڕووی جۆری بەکارهێنانی ئامرازە ئەلیکترۆنییەکان.
١٣. دیار نەبوونی فەلسەفەی پەروەردە و فێرکردن یان دارشتنی پلانی هەڵە.
١٤. دەستخۆشی لێ نەکردن و گوێ پێ نەدان.
١٥. وەک پێویست لایەنی ماددی بۆ پڕ نەکرێتەوە.
١٦. گرنگی نەدان بە پرسیار و وتەکانی.
١٧. باوک و براو گەورەکان بە سیستەمی سەربازی ڕەفتار بکەن.
١٨. ئەگەر لە شتێکدا شکستی هێنا، هەوڵ نادرێ بۆ ڕاستنەکردنەوەی.
١٩. گوێ نەدان بە پێداویستییەکانی خوێندن.
٢٠. جیاوازیکردن لە نێوان منداڵەکان بەتایبەت نێوانی کوڕ و کچ.
٢١. شکاندنەوەی لەبەر چاوی خەڵک.
٢٢. گوێ نەدان بە بەهرەکانی.

## فکرەی بیست و شەشەم: گرنگیدان بە لەدایکبوونی منداڵ

١. پەروەردەی منداڵ لەو کاتەوە دەستپێ دەکا کە دەبێ بزانی چ دایکێک یان چ باوکێک بۆ منداڵەکەت هەڵدەبژێری، کەسێک لە زانایەکی پرسی وتی: مامۆستا منداڵەکەم تەمەنی چوار مانگە، واتا دایکی دووگیانە، پێم بڵێ چۆن پەروەردەی بکەم؟ وتی: درەنگ پرسیارت کرد و دواکەوتی، دەبوو لە سەرەتاوە پرسیارت کردبا کێ بخوازی.

٢. گرنگیدانی تەواو بە لایەنی تەندروستی دایکی منداڵ، بۆئەوەی منداڵەکە تەندروست بێ، وەک لەژێر چاودێری دکتۆردا بوون و خواردنی پێویستی بۆ دابین بکرێ.

٣. پێشوازی لە منداڵ بکرێ بە سەربڕینی حەیوان.

٤. هەڵبژاردنی ناوی خۆش.

٥. سەرتاشین ئەگەر کوڕ بوو.

٦. خورما دە زار وەردان (تحنیک).

٧. شیری دایک بە منداڵ بدرێ، مەگەر بەناچاری نەبێ.

٨. دڵخۆشبوون پێی.

٩. گرنگی پێدانی تەواو و پێدانی خۆشەویستی.

## فکرەی بیست و حەوتەم: پەروەردی منداڵ لە ڕووی تەندروستییەوە

١. هەستان بە ئەرکی نەفەقەکێشانی ماڵ و منداڵ بەتەواوی، ئەمە ئەرکە لەسەر بەخێوکەر بەتایبەت باوکان.
٢. ڕەچاوکردنی بنچینەکانی تەندروستی لە خواردن و خواردنەوە و خەوتن.
٣. پاراستنی منداڵ لەو نەخۆشییانەی کە پەرەدەستێنن و زوو چارەسەرکردنی.
٤. کوتانی منداڵ لە کاتی خۆیدا.
٥. لە کاتی گونجاودا فێرکردنی ئەو وەرزشانەی کە لەگەڵ تەمەنی ئەودا گونجاوە.
٦. هەوڵ بدرێ منداڵ زیاد لە پێویست بەناز پەروەردە نەکرێ، چونکە دواتر بەرگەی ناخۆشییەکان ناگرێ.
٧. هەروەها زۆریش بە زبری پەروەردە نەکرێ، بۆئەوەی ناتەندروست و مەحروم دەر نەچێ، نەوەک هەست بکا کە ئیهمالکراوە.
٨. پاراستنی منداڵ لە تووشبوون بە جگەرەکێشان و مادده سڕکەرەکان و کحولییەکان.
٩. پاراستنی لە هاوڕێی خراپ.
١٠. زیادەڕەوی نەکردن لە سەیرکردنی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان.
١١. پاراستنی لە هۆکارەکانی وروژاندن.
١٢. پڕکردنەوەی کاتەکانی بە کاری باش و بەسوود.
١٣. جۆری خوێندن و پەروەردە زۆر کاریگەرن بەسەر تەندروستی منداڵەوە.
١٤. ڕۆشنبیری باوک و دایک زۆر گرنگە بۆ تەندروستی منداڵ.

## فكرەی بیست و هەشتەم: پەروەردەی سێكسی منداڵ

١. لەمڕۆدا دەرگاكانی میدیا بەسەر هەموو چین و توێژەكاندا كراوەتەوە بێسانسۆر، بۆیە لەمڕۆدا پەروەردەی جنسی زۆر بەزەحمەت بووە.
٢. بەهێزی ئیمانی و ئەخلاقی دایک و باوک و گەورەكان زۆر كاریگەرە بۆ منداڵ، بۆیە دەبێ سەرەتا ئاگاداری خۆیان بن و ڕەفتاری سێكسی لەبەردەم منداڵەكانیان نەنوێنن و باسی نەكەن.
٣. دەبێ منداڵان بەپێی تەمەنیان لە زانیارییە جنسییەكان ئاگادار بكرێنەوە، بۆ نموونە كچێک یەكەم جار تووشی سووڕی مانگانە بێ لەوانەیە شۆک بێ و تووشی حاڵەتی دەروونی بێ، بۆیە گرنگە دایكان زانیاری بدەن بە كچەكانیان.
٤. منداڵ فێری ئیزنوەگرتن بكرێ لە ماڵەوە و لە شوێنانی دیكەش.
٥. منداڵ بەپێی تەمەن لەگەڵ جلوبەرگی شەرعی بار بهێنرێ، بەڵام بەتۆبزی و خورتی نەبێ، بەڵكو دەبێ لای جوان و خۆشەویست بكەی.
٦. جێگە لێک جیاكردنەوەی كچ و كوڕ یان لەگەڵ دایک و باوک كاتێک لایەنی جنسییان نەشونما دەكات.
٧. دیسان دەبێ وریا بین لە هاوڕێی خراپ، چونكە زۆر كاریگەرە و كارەساتی خراپی لێ دەكەوێتەوە.
٨. تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان ڕاستەوخۆ كاریگەرییان هەیە، ڕاگەیاندن پێی دەوترێ: دەسەڵاتی چوارەم، بەڵام بە كردەیی بۆتە دەسەڵاتی یەكەم.
٩. خێرخوازان بیر لەوە بكەنەوە میدیای ئامانجدار دروست بكەن و سەرنجڕاكێش بێ و بتوانێ ببێتە جێگرەوەی میدیا خراپەكان.
١٠. وریاكردنەوەی منداڵ لەو نەخۆشییە ترسناكانەی كە بەهۆی بەدڕەوشتییەوە دەگوازرێتەوە، ئەگەر بە ڕاپۆرت و دات او وتەی زانایان بێ زۆر باشە و كاریگەرە.
١١. منداڵ كە گەورە دەبێ لە تەمەنی گونجاودا هەوڵی زەواجی بۆ بدرێ.

## فکرەی بیست و نۆیەم: پەروەردەی ئیمانی منداڵ

١. منداڵ بوونەوەرێکە زۆر بە قابیلیەتە و زۆر بەهێزە بۆ وەرگرتن، بۆیە دەبێ بزانین چی لەسەر تۆمار دەکەین، دواتر خۆمان بەرپرسیارین کە خراپ هەڵسوکەوتی کرد، چونکە شتی باشمان لەسەر تۆمار نەکردووە.

٢. منداڵ ئەمانەتێکی گەورەیە، بۆیە خیانەت لەو ئەمانەتە لە هەر خیانەتێک گەورەترە، چونکە خیانەت لەم ئەمانەتە و پشتگوێخستنی دین و دنیای وێران دەکا.

٣. خودای گەورە دەربارەی ماڵ و منداڵ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ١٥ ﴾ التغابن: ١٥، واتا: بێگومان دارایی و منداڵتان هەر هۆی تاقی کردنەوەتانن لە کاتێکدا خودا پاداشتی زۆر و گەورەی لەلایە. کەواتا ماڵ و منداڵ تاقیکردنەوەیە، دەرچوون لەم تاقیکردنەوەیە پاداشتێکی گەورەی هەیە.

٤. ماڵ و منداڵ تاقیکردنەوەیە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤ ﴾ التغابن: ١٤، واتا: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بەڕاستی هەندێ لە ژنان و منداڵانتان دوژمنی ئێوەن، جا خۆتانیان لێ بپارێزن، وە ئەگەر (لێیان) ببورن وە وازبێنن (لێیان) وە (لێیان) خۆش بن، ئەوە بێگومان خوداش لێخۆشبووی میهرەبانە. کەواتا ئەگەر ماڵ و منداڵ هەڵەیان کرد نابێ تۆڵەیان لێ بکەینەوە، بەڵکو دەبێ سینگمان فراوان بێ و دڵمان گەورە بێ، بەڵکو دەبێ هەڵەکانیان بەم سێ شتە چارەسەر بکەین:

- (صفح): واتا چاوپۆشی و چاو لەسەر لادان.
- (عفو): واتا ڕەشکردنەوەی شوێنەواری ڕق و قینە لە دڵدا، بۆئەوەی بتوانی پێ بکەنی لەگەڵیان و ڕوویان تێ بکەی.
- (غفران): واتا چاوپۆشی ئەم ڕەوشتانە زۆر کاریگەرن.

٥. دەستیان بگرین بۆ مزگەوت و دینداریيان لا خۆشەویست بکەین.
٦. بابەتەکانی ئیمانیان فێر بکەین بەسادەیی و هاندانەوە.
٧. زیکر و ئادابەکانیان فێر بکەین.
٨. بتوانین پاداشتیان بکەین لەسەر کاری چاکە، چونکە دڵیان پێ خۆش دەبێ.
٩. مانای وا نییە کە ئێمە ئیهمالی دەکەین و قەت خۆمان گرژ ناکەین، بەڵام خۆتوڕەکردن و سزادان بۆ تۆڵەسەندنەوە نییە، بەڵکو بۆ ڕاستکردنەوەیە.
١٠. لە هەموو دنیا سزا بۆ دوو ئامانجە:
- بۆ قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتوو.
- بۆ تەمبێکردنی تاوانبار، بۆئەوەی هەمان ڕەفتار لەلایەن کەسانی دیکەوە دووبارە نەکرێتەوە.

١١. ئێمە چۆن لەگەڵ ئەم فەرموودەیە مامەڵە بکەین کە دەفەرمووێ: لە منداڵەکانتان بدەن کاتێ نوێژیان نەکرد لە تەمەنی دەساڵی: « قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بِالصَّلَاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ " ».[1] وەلەگەڵ ئەم ئایەتە کە خودا دەفەرموێ: ﴿وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَاۖ لَا نَسۡـَٔلُكَ رِزۡقٗاۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَۗ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ ١٣٢﴾ طه: ١٣٢، واتا: ئەی موحەممەد ﷺ فەرمان بدە بە ئەندامانی خێزانەکەت بە نوێژکردن و خۆشت خۆڕاگر و بەردەوام بە لەسەر بەجێهێنانی، ئێمە داوای ڕۆزیت لێ ناکەین، بەڵکو ئێمە ڕزق و ڕۆزی تۆ دەدەین و سەرەنجامی چاك بۆ پارێزکاران و خوداناسانە.

چارەسەر ئەوەیە بەردەوام بین لەسەر ئامۆژگاریکردنی بەخۆشی، بەڵام ئەگەر ئامۆژگاری سوودی نەبوو و گەیشتە بنبەست، وە خۆتوڕەکردن و لێدان بە خەفیفی سوودی هەبوو دەکرێ بەکار بهێنرێ، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە پێویستە هاندان بەردەوام بەخۆشی بێ:

یەک: لەبەر ئایەتەکە.

دوو: لەبەر بواری کردەیی پێغەمبەرمان ﷺ کە قەت ڕەقی و لێدانی بەکار نەهێناوە.

سێ: فەرموودەکەش کێشەی لەسەرە.

---

[1]- سنن أبي داود: ٤٩٥.



١٢. گێڕانەوەی چیرۆکی چاکەکاران.
١٣. بەدەستخستنی ئەو فیدیۆ و سیدییانەی کە چیرۆکی باشی تێدایە و لایەنی ئیمانی منداڵ بەهێز دەکات.
١٤. دیسان دووبارەی دەکەینەوە هاوڕێی باشی هەبێ، چونکە منداڵ لە هەر کەس زیاتر بە منداڵ کاریگەرە.
١٥. گرنگیدان بە کتێب و نامیلکەی باش و وێنەدار و سەرنجراکێش.
١٦. پەیوەندیکردنی منداڵ بە نێوەندە زانستی و پەروەردە ئایینییەکان.

## فکرەی سییەم: پەروەردەی دەروونی منداڵ

١. ئامانج لە پەروردەی دەروونی ئەوەیە منداڵ بە پەروەردەیەکی ئیسلامی جوان پەروەردە بن کە سەرچاوەکەی قورئان و سوننەت بێ.
٢. منداڵ ئاشنا بکەین بە خەسڵەتە جوان و پەسندەکان، وە دوور بێ لە خەسڵەتە بەد و ناشیرینەکان.
٣. نموونەی جوان بۆ ئەوان بگێڕینەوە، مەرج نییە نموونەکان بەس لە ڕابردوو بێ، لە ئێستاشدا نموونەی جوانی ڕەوشتبەرزی زۆرە.
٤. یەکێک لە خەسڵەتەکان کە زۆر گرنگە خەسڵەتی ئازایەتییە، ئازایەتی جیاوازە لە دڕندایەتی.
٥. یەکێك لەو خەسڵەتە بەرزانە بریتییە لە داوێنپاکی کە زۆر پەیوەستە بە لایەنی دەروونی، ئەوانەی لە دەرووندا لاوازن زوو دەتەپن.
٦. بارهێنانی منداڵ لەسەر خۆشەویستی دەوروبەر وای لێ دەکا کە زۆر متمانەی بە خۆی بێ.
٧. منداڵ وا لێ بکەین شوێنکەوتووی ئارەزووەکانی نەبێ یان هەرچی حەزی لێبوو داوای نەکات و هەڵپەی بۆ نەکا، بەتایبەت ئەگەر شتەکە نەگونجاو بێ.
٨. لە بەرانبەر خزمەتکردندا داوای پارە و یارمەتی لە خەڵک نەکا.
٩. بەردەوام وای لێ بێ لە نوێژ دوا نەکەوێ.
١٠. خەڵک بەکەم سەیر نەکا.
١١. میوان بێزار نەکا، یان لە کاتی میوانی خەڵک هەراسان نەکا.
١٢. وای لێ نەیە شەرم لە کەس نەکا.
١٣. خۆ پاراستن لە جگەرەکێشان و نێرگەلە و مەشروباتە غازییەکان، بەتایبەت ئەوانەی کە خراپن.
١٤. پاراستنی لە نەوسنی و زۆرخۆری.
١٥. پاراستنی لە هاوار هاوار و دەنگبەرزکردن.
١٦. بەردەوام هەوڵی ئەوە بدا خەڵک بخاتە پێکەنین.



١٧. پاراستنی لە ئیرەیی و تەماعکاری.
١٨. بێزار نەکردنی جیران.
١٩. ڕێزگرتن لە مامۆستا و لە خۆ گەورەتر.

## فکرەی سی و یەکەم: پەروەردەی سۆزداری منداڵ

١. مەبەست لە پەروەردەی عاتفی ئەوەیە منداڵ هەست بە بوونی کەسایەتی خۆی بکات.
٢. منداڵ متمانەی بە خۆی لادروست ببێ.
٣. پێویستە لە نێوان منداڵەکان بەدادگەری مامەڵە بکەین، بۆئەوەی نەشکێنەوە و سەرکز و ترسنۆک نەبن، یان بۆئەوەی ڕقاوی و قین لەدڵ دەرنەچن.
٤. جوان پێشوازیکردنی منداڵ کاتێک کە ڕووت تێ دەکا یان لە شوێنێک دەگەڕێتەوە.
٥. گوێ بۆ گرتنی کاتێک قسە دەکا.
٦. وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی.
٧. پێی بڵێ: زۆرم خۆش دەوێی، زۆر جوانی.
٨. لەباوەشی بگری.
٩. ماچی بکەی.
١٠. ناوی جوانی لێ بنێی، وەک بڵێی: گوڵەکەم، دڵەکەم، ئازیزەکەم، ... هتد.
١١. دەستبەسەرداهێنان.
١٢. لە پەنای ئەو خۆ لە یەکدی توڕە نەکردنی دایک و باوک.
١٣. یاری لەگەڵدا کردن.
١٤. بەکەم سەیر نەکردن و جوێن پێ نەدان و هەڕەشە لێ نەکردن.
١٥. نەهێڵی کێشە و ئیرەیی بکەوێتە نێوان منداڵەکان، بەهۆی جیاوازی لە دادگەری، ڕووتێکردن، یارمەتیدان، ... هتد.
١٦. ئەوانەش کە ناتەواون لە هەر ڕوویێکەوە بێ زیاتر پێویستییان بە ئاوڕدانەوەیە.

## فكرەی سی و دووەم: پەروەردەی خۆراكی منداڵ

ئەم بابەتە تەواو هەستیارە پێویستی بە پسپۆری تەواوە، بەڵام چەند ڕێنماییەكی گشتی باس دەكەم:

١. خۆراك نیعمەتێكی گەورەی خوداییە و ژیان بەبێ خۆراك نابێ.
٢. هەموو جۆرە خۆراكەكان پێویستن، بەڵام دەبێ بەپێی پێویست بێ، مەگەر پزیشك بە كەسێك بڵێ: فلان خواردەمەنی بۆ تۆ باش نییە و زیانی هەیە.
٣. نابێ بە هیچ شێوەیەك خواردنی بەسەرچوو بەكار بێنین.
٤. ڕێكخستنی كاتی خواردنەكان بۆ منداڵ زۆر گرنگە.
٥. خواردن لەسەر خواردن نەخورێ، جاری وایە سەعات دە نانی بەیانی دەخۆن، وە سەعات دوازدەش خواردنی نیوەڕۆ دەخۆن، ئەمە زۆر خراپە بۆ تەندروستی و قەڵەوبوون.
٦. شۆردنی دەستەكان پێش نانخواردن و دوای نانخواردن.
٧. خواردن جوان بجورێ و پەلەی تێدا نەكرێ.
٨. هەوڵ بدە منداڵەكەت زیاد لە پێویست نەخوا.
٩. یەكسەر دوای خواردن نەخەوێ.
١٠. خواردنەكان جۆراوجۆر بن و منداڵ بەس یەك جۆرە خواردن نەخوا.
١١. سەوزە و میوە بەپێی پێویست، واتا بەپێی پێویست بە منداڵ بدرێ.
١٢. خواردنی زۆر گەرم یان زۆر سارد بەمناڵ نەدرێ.
١٣. هەتا بكرێ خواردنی كۆن و گەرمكراوە نەخورێ.
١٤. كەمكردنەوەی خوێ، شەكر، نیشاستە.
١٥. كەمكردنەوەی شیرنەمەنییەكان.
١٦. كەم خواردنەوەی چا، قاوە، ... هتد.
١٧. بەكار نەهێنانی دەفری نایلۆن و پلاستیك بەتایبەت بۆ شتی گەرم.
١٨. پێدانی بڕی پێویست لە ئاو.
١٩. ئەگەر منداڵ كێشەی خواردنی هەبوو زوو سەردانی پزیشكی پسپۆڕی پێ بكەی.

٢٠. بەپێی توانا خواردنەکانی نێو قوتو سەفەری نەخورێ.
٢١. تا بکرێ خواردن لە ماڵ ئامادە بکەن، نەوەک بەردەوام خواردن لە دەرەوە بێننەوە.
٢٢. نەخواردنی خواردنەوە گازییەکان، چونکە زیاد لە پێویست شەکریان تێدایە.
٢٣. بە هیچ شێوەیەک خواردنەوە کحولییەکان نەدرێ بە منداڵ و لەسەر سفرە نەبێ.
٢٤. لەسەر نانخواردن هیچ شتێکی سەرقاڵکەر و سەرنجڕاکێشی لەبەردەمدا نەبێ، بۆئەوەی ئیشتیای لەسەر خواردنەکە بێ و سوودی لێوەرگرێ.
٢٥. بەتۆبزی خواردن بە منداڵ نەخۆین، بەڵکو و هانی بدەین.

## فکرەی سی و سێیەم: پەروەردەی وەرزشی منداڵ

١. ئامانج لە پەروەردەی وەرزشی ئەوەیە منداڵ لاشەیەکی تەندروست و چالاکی هەبێ.
٢. وەرزش ببێتە بەشێکی دانەبڕاو لە ژیانی منداڵ.
٣. منداڵ فێری چەندین جۆر وەرزشی سەردەمییانە و بەسوود بکرێ، بەتایبەت ئەو وەرزشەی کە لەگەڵ حەزی ئەو بێتەوە.
٤. وەرزش هۆکارە بۆ بەهێزی و تەندروستی و قەڵەو نەبوون.
٥. وەرزش هۆکارە بۆ زیرەکی.
٦. کاتی گونجاوی بۆ دابنرێ بۆ وەرزشکردن.
٧. شوێنی گونجاو و تایبەت هەبێ بۆ وەرزش.
٨. بەرگی تایبەتی بۆ دابین بکرێ بۆئەوەی هەست بە ڕەسمیات و گرنگیپێدان بکات.
٩. هاندان بۆ وەرزشکردن بۆئەوەی پێشکەوتوو بێ.
١٠. وەرزش بەشێوەیەکی هاوسەنگ بێ.
١١. نابێ بەهێزبوونی باز و ماسولکەکانی لەسەر حیسابی لاوازی ژیری بێ.
١٢. پێغەمبەری خودا ﷺ هانمان دەدا لەسەر: ڕاکردن، ئەسپسواری، تیرهاوێژی، ڕمبازی، مەلەکردن.

## فکرەی سی و چوارەم: پەروەردەی کۆمەڵایەتی منداڵ

١. ئادابە کۆمەڵایەتییەکان بۆ منداڵ زۆر گرنگە، مەبەستمان لە منداڵ ئەوە نییە کە تەمەنی زۆر بچووک بێ، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە بچووک بێ، یان هەرزەکار بێ، یان هەتا ئەگەر گەنجیش بێ.

٢. ڕێزگرتن لە گەورە، دایک و باوک، برا و خوشک، گەورە و بچووک، هاوڕێ، مامۆستا، بەتایبەت دەبێ وردە وردە ئەم ئادابانە فێر بکرێ:

- ئادابی سەلامکردن.
- ئادابی چوونە ماڵان و لەدەرگەدان و ئیجازەوەرگرتن.
- ئادابی چوونە مزگەوت.
- ئادابی خۆشوشتن و چوونە سەرئاو.
- ئادابی خواردن و خواردنەوە.
- ئادابی جلوبەرگ پۆشین و دانان.
- ئادابی گەشتوگوزار و ژینگەپارێزی.
- ئادابی کۆڕ و مەجلیس.
- ئادابی پیرۆزباییکردن لە بۆنە و جەژنەکان.
- ئادابی گاڵتەوگەپ بەشێوە هەرە جوان و دروستەکەی.
- ئادابی سەردانی نەخۆش و پرسە.
- ئادابی پێکەنین و قسەکردن.
- ئادابی پشمین و باوێشک.
- چاکەی خۆش بوێ و هاوکار بێ بۆی.
- ڕقی لە خراپە بێتەوە و بیبێزێنێ.

٣. شارەزاکردنی لە ژیانی پیاوچاکان و هەڵسوکەوتیان.

٤. شارەزاکردن و ئاشناکردنی بە منداڵە گەنجە سەرکەوتووەکان.

٥. ڕەوشتبەرز بێ و ڕێزی خۆی بپارێزێ.

٦. دەبێ هەموو ئەم شتانەی بە تەدریجی و لەسەرخۆیی و پێ بە پێ پێ بوترێ.

## فکرەی سی و پێنجەم: پەروەردەی ژیری منداڵ

١. گرنگترین هۆکار بۆ فرەوانبوونی ژیری منداڵ لایەنی فێرکردن و پەروەردەکردنە، ئێمە دەبێ لە هەموو قۆناغەکان بەپێی پێویست گرنگی بە فێرکردن بدەین.
٢. لایەنی ڕۆشنبیری منداڵ لەو بوارانەی بەپێی قۆناغەکانی ژیانی پێویستی پێیەتی.
٣. لایەنی خوێندنەوە زۆر گرنگە بۆ گەشەی ژیری منداڵ، ئەو نامیلکە و سایت و کتێبانەی لەگەڵ تەمەنی ئەو گونجاوە بۆی پەیدا بکرێ و بکرێتە ماڵی ئەو.
٤. بوونی کتێبخانەیەک گرنگە بۆئەوەی منداڵ هۆگری بە کتێب بێ و خۆشی بوێ.
٥. پاداشتکردنی منداڵ لەسەر خوێندنەوە هاندانێکی زۆر باشە.
٦. یەکەم ئایەت لە قورئاندا باسی خوێندنە.
٧. خودای گەورە فێرمان دەکا داوای زیادبوونی زانست بکەین.
٨. پێشبڕکێ لە نێوان منداڵەکان دروست بکەین بۆ زیاتر ڕۆشنبیری و زانیاری گشتی.
٩. منداڵ نابێ فشاری لەسەر بکرێ، بەڵکو هەوڵ بدرێ لە ڕووی خۆشەویستکردنی ئەم بابەتانەوە بێ نەوەک بەزۆری پێی بکرێ.
١٠. هەوڵ بدەین بەهرەی منداڵەکانمان بدۆزینەوە و پەرەی پێ بدەین.
١١. دایک و باوک قوتابخانەی یەکەمن بۆ لایەنی کەسایەتی و ژیری منداڵ، دواتر خوێندن بە هەموو قۆناغەکانییەوە، دواتر هاوڕێی باش.
١٢. با ئەو خاڵەشتان بیر بخەمەوە، پاکوخاوێنی و بۆنخۆشی کاریگەری لە سەر هەموو لایەنەکانی منداڵ هەیە.

## فکرەی سی و شەشەم: پەروەدەکاری سەرکەوتوو کێیە؟

١. پێش هەموو شتێک دەپێ پەروەردەکار دڵسۆز و بەخەم بێ، چونکە نهێنی سەرکەوتن لە هەر کارێک دڵسۆزیە، هەر کەس دڵسۆز بێ تووشی ڕیا و ڕوپامایی نابێ و سارد نابێتەوە.

٢. پسۆڕی و شارەزایی، بەڵام بەس لایەنی تیۆری بەس نییە دەبێ بە تەجرەبە و بە کردەوە بێ.

٣. ئەمانەت و دەستپاکی، چونکە منداڵ لە هەر شتێک خۆشەویستترە، ناکرێ مامۆستا و پەروەردکارەکەی ئەمین و دەستپاك و دڵپاک نەبێ.

٤. هێز و توانا و قابیلیەت، چونکە هەیە بە نەزەری بە توانایە، بەڵام توانای جێبەجێکردنی نییە یان لاوازە.

٥. دادپەروەری لە نێوان قوتابییەکان و منداڵەکاندا، چونکە ئەگەر پەروەردەکار دادگەر نەبێ ناتوانێ کاریگەری ڕاست و دروست دابنێ.

٦. سووربوون و کۆڵ نەدان و هەوڵدان بۆ سەرکەوتن و ژمارە تۆمارکردن بەبەردەوامی.

٧. چاکەخوازی و چاکەکاری بەبەردەوامی، نەوەک بەناچاری و زۆرلەخۆکردن و پارە و ڕیایی.

٨. ڕاستی و ڕاستگۆیی و ڕاسترەفتاری و ڕاستهەڵوێستی.

٩. لێزانی هەر منداڵە و کلیل و کۆدی تایبەتی خۆی هەیە، دەبێ پەروەردەکار ئەمە باش بزانێ.

١٠. نەرمونیانی و لێبوردەیی، چونکە ڕووحی پەروەدە لێبوردەییە، بۆیە کەسێک نەتوانێ لێبوردە بێ ناتوانێ ببێتە مامۆستا.

١١. خۆبەدوورگرتن لە تورەیی و گرژبوون و هەڵچوون.

١٢. بەردەوام دەستگرتن بە ئاسانکاری، مانای ئەوە نییە فێرکارەکە پێش ناخەین و ماندووی ناکەین، بەڵکو هەتا بکرێ هاوکاری دەبین و دەستی دەگرین و هاندەری دەبین.

١٣. میانەڕەوی لە نێوان توندی و شلیدا.
١٤. هەموو کات ئامۆژگاری نەکات، چونکە بێزار دەبێ، دەبێ ئامۆژگاری:
- لە کاتی پێویست
- لە شوێنی پێویست
- بەپێی پێویست
- بە وشەی گونجاو و پێویست بێت.

١٥. خوێندنەوەی بەردەوام و ئاگاداربوون لە مەنهەج و شێوازە تازە و سەکەوتووەکانی پەروەردە.

# فکرەی سی و حەوتەم: شێوازەکانی پەروەردە

مەرج نییە پەروەردە بەس بە ئامۆژگاری و قسەکردن بێ، بەڵکو دەکرێ بە زۆر شێوازی دیکەش بێ، وەک:

- پەروەردە بە سزادان بێ، بەڵام ئەوە ئەسڵ نییە لە پەروەردەدا، بەڵکو لە ناچاری پەنای بۆ دەبردرێ و تەنیا ئەو کاتانەی کە چارەسەرە، ئەوەش مەرج نییە بە لێدان بێ، دەکرێ بە هەڕەشە بێ، دەکرێ بە قسەلەگەڵنەکردن بێ، دەکرێ لە نمرەی بشکێنی، دەکرێ بڵێی: نابێ دووبارەی بکەیەوە، دەکرێ بڵێی: ناهێڵم ئایپادەکەت یان موبایلەکەت ئەوەندە ماوەیە بەکار بێنی، یان بڵێی: ڕۆژانەکەت نادەمێ، یان کەمی دەکەمەوە، یان ئەو سەفەرەت پێناکەم، ... هتد.
- پەروەردە بەهاندان و پاداشتکردن، جۆرەها پاداشتکردن هەیە لە دیاری و پارە و ئافەرین و دەستخۆشی و سەفەرپێکردن و پیاهەڵدان و نمرە بەرزکردنەوە و ... هتد.
- پەروەدە بە کردەوە و ڕەوشتی جوان، مەرج نییە بەس ئوسلوبێکی تایبەت بەکار بێنی دەکرێ بەشێک لە پەروەردە ڕەفتارە جوانەکانی خۆت بێ.
- دەکرێ پەروەردە بە دەربڕینی پەروەردە بێ بەشێوازی جوان.
- دەکرێ پەروەدە بە چاوپۆشی لە هەندێ شت بێ.
- دەکرێ بە پێدانی کتێبێک، سیدییەک، دیارییەک بێ.
- دەکرێ بە پێسپاردنی کارێک بێ.
- دەکرێ بە پەیداکردنی هاوڕێی باش بێ.
- وە ڕێباز و شێوازی دیکەش زۆرن.

لەوانەیە بوترێ: ئەم بابەتانە چ پەیوەندییان بە ڕەمەزانەوە هەیە؟ بەڵێ پەیوەندی زۆرە:

- لە ڕەمەزاندا دڵەکان تەواو ئامادەن بۆ ئامۆژگاری.
- دەوری شەیتانە یاخییەکان کەم دەبێتەوە.
- منداڵان زیاتر سەردانی مزگەوتەکان دەکەن.



- دەکرێ ڕەمەزان دەسپێکی گۆڕانکاری بێ.
- بەشێک لە دایک و باوکان سەرنجیان لەسەر لایەنی پەروەردە نییە، بەڵکو سەرنجیان لەسەر نانپەیداکردن و بەخێوکردنە.

## فکرەی سی و هەشتەم: کردنەوەی دەورە بۆ دەستنوێژ بۆ منداڵان

کردنەوەی دەورەی دەستنوێژ و بانگ و نوێژ بۆ منداڵان زۆر گرنگە، چونکە زۆرێک لە منداڵان دەستنوێژ و نوێژ نازانن، بگرە گەنجەکانیش وە هەتا بەشێک لە بەساڵاچووەکانیش، با ئیمام دەستیان بگرێ و بیان با بۆ جێگەی دەستنوێژ و بەکردەوە فێریان بکات، تکایە بۆ خوشکانیش ئەمە گرنگە هەموو کاتێ، بەڵام بەتایبەت ڕەمەزانان.

## فكرەی چل و دووەم: دەستخۆشی و پاداشتكردنی ئەو گەنج و منداڵانەی كە زۆرترین ئامادەییان هەبووە لە نوێژەكان بەجەماعەت لە مزگەوتدا

## فکرەی چل و سێیەم: بوونی کتێبخانە لە ماڵ و لە مزگەوت زۆر گرنگە و سەرچاوەیەکی گەورەی ڕۆشنبیری و مەعریفییە

## فکرەی چل و چوارەم: شەونوێژ، تەڕاویح

سەرەتا گوێ بە قسەی هیچ کەسێک مەدەن و بەگوێیان مەکەن کە دەڵێن: تەڕاویح نییە و سوننەت نییە، ئەوانە نە شارەزای قورئانن، نە شارەزای سوننەتن، نە شارەزای بۆچوونی زانایانن، نە لە زمان و ئوسلوبی عەرەبی تێ دەگەن، نە هێندەش دیندرا و بەتەقوان، نە پرسیش بە ئەهلی علم دەکەن، نە شعوری یەک گەل و ئوممەت دەپارێزن، نە هیچ گرفتێکی فقهی و فکرییان پێ حەل دەبێ، تەنیا بۆ خۆناساندن و موتابع پەیداکردن هەندێ بابەت دەورووژێنن کە ئوممەت لەسەری یەک دەنگە، بۆیە موسوڵمانی بەڕێز یەقینی خۆت بە گومانی ئەوان مەدە، ئەگەر تەحەددایان بکەی بڵێی: بەپێی قورئان نوێژم بۆ بکەن بەبێ سوننەت، ئایا دەتوانن وەڵام بدەنەوە؟! یان حەج بکەن یان زەکات بدەن، بێگومان ناتوانن، ئەگەر ڕاست دەکەن با بۆمان ڕوون بکەنەوە.

## فکرەی چل و پێنجەم: گەورەیی شەونوێژ و تەراویح لە قورئاندا

لە قورئانی پیرۆزدا بە جۆرەها شێوە باسی شەونوێژ کراوە لەوانە:

١. ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ السجدة: ١٦، واتا: تەنشتیان دوور دەکەوێتەوە لە جێگەی خەوتنیان (لەخەو هەڵدەستن شەونوێژ دەکەن) هاوار و نزا لە پەروەردگاریان دەکەن بەترس و هیواوە و لەو ڕۆزی و سامانەی پێمان داون دەبەخشن. مەدحی بڕواداران کراوە بەوەی کە شەوانە جێگەکانی خەوتنیان بەجێ دەهێڵن و دەڕۆن لە خزمەتی پەروەردگاریان ڕادەوەستن و شەونوێژ و نزا دەکەن، پەروەردگار لە دوارۆژدا چاویان بەم عیبادەتی شەونوێژە ڕوون دەکاتەوە.

٢. ﴿ كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ الذاريات: ١٧، واتا: ئەوانە کەمێك لە شەودا دەخەوتن. واتا شەونوێژیان دەکرد، پەروەردگار لەسەر کەمخەوییان مەدحیان دەکا، نەوەک زۆر بە خەبەرییان کە هەر دووکی یەک واتایە، بەڵام ئەوە مانای وایە خەوتنەکەشیان عیبادەتە.

٣. ﴿ وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا ﴿٦٤﴾ ﴾ الفرقان: ٦٤، واتا: وە کەسانێکن لە شەودا بۆ پەروەردگاریان سوژدە دەبەن و شەونوێژ دەکەن.

٤. پێغەمبەری خودا ﷺ لە هەموو کەس پابەندتر بووە بە شەونوێژەوە بە فەرمانی پەروەردگار: ﴿ يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢﴾ نِّصْفَهُ أَوِ انقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ ﴾ المزمل: ١ - ٣، واتا: ئەی ئەو کەسەی کە خۆت داپۆشیوە، شەو هەستە (شەونوێژ بکە) مەگەر کەمێکی نەبێت، یا کەمێ لە نیوەی کەم بکەرەوە.

٥. ﴿ وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ ﴾ الإسراء: ٧٩، واتا: وە (ئەی موحەممەد ﷺ) لە بەشێکی شەودا هەستە شەونوێژ بکە

بە قورئان خوێندن تێیدا، ئەوە زیادەنوێژی تایبەت بە تۆیە، ئومێدەوار بە پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلە و جێگەیەکی پەسەندکراو.

٦. ﴿ ۞ لَيْسُوا۟ سَوَآءً ۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾ آل عمران: ١١٣، واتا: هەموو (نامەدارەکان) چوون یەک نین، لەنێو خاوەننامەکاندا دەستەیەک ڕاست و ڕێک هەن ئایەتەکانی خودا دەخوێنن لە (کاتەکانی) شەودا وە لە (کاتەکانی) کڕنوش بردنیاندا.

٧. ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَـٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٩﴾ ﴾ الزمر: ٩، واتا: هاوبەشدانەران چاکترن یا کەسێ ملکەچ و پەرستکارە (بۆ خودا) لە کاتەکانی شەودا بە سوژدە بردن و ڕاوەستان (لە شەونوێژدا) کە لە (سزای) دوارۆژ دەترسێت و بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریەتی، (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن؟ بەڕاستی تەنها خاوەنانی ژیری ئامۆژگاری وەردەگرن.

٨. ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ ﴾ الإنسان: ٢٦، واتا: وە لە شەودا سوژدەی بۆ بەرە (نوێژ بکە)، وە ستایشی خودا بکە لە بەشێکی زۆر لە شەودا.

٩. ﴿ ٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰدِقِينَ وَٱلْقَـٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ﴿١٧﴾ ﴾ آل عمران: ١٧، واتا: ئەوانە بریتین لە ئارامگران و ڕاستگۆیان و فەرمانبەران و دارایيبەختکەران و ئەوانەی کە داوای لێخۆشبوون دەکەن لەپێش بەیانییاندا.

## فكرەی چل و شەشەم: شەونوێژ لە فەرموودەی سەروەرماندا ﷺ

١. خەوتن بە نیەتی شەونوێژ و بە پاكی: « " مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَبِيتُ عَلَى ذِكْرٍ طَاهِرًا فَيَتَعَارُّ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا مِنَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ " ».[١] واتا: هەر موسوڵمانێک شەو بخەوێ بە دەستنوێژەوە، كە شەو بەخەبەر هات با زۆریشی ئاگالەخۆ نەبێ، هەر داوایەک بكا پێی دەدرێ و وەڵام دەدرێتەوە.

٢. « " مَنْ أَتَى فِرَاشَهُ وَهُوَ يَنْوِي أَنْ يَقُومَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ حَتَّى أَصْبَحَ كُتِبَ لَهُ مَا نَوَى، وَكَانَ نَوْمُهُ صَدَقَةً عَلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ " ».[٢] واتا: هەر كەس چۆ سەر جێگەی خەوتن نیەتی وا بوو شەو هەڵبستێ شەونوێژ بكا، لە پاشان وەخەبەر نەهات تا بەیانی، بەپێی نیەتەكەی شەونوێژەكەی بۆ حیسابە و خەوەكەشی چاكەی خێری پەروەردگارییە بەسەریەوە.

٣. « " نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ " ».[٣] واتا: باشترین كەس عەبدوڵڵای كوڕی عومەرە ئەگەر بێت و شەونوێژان بكا.

٤. « " أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ؛ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ، وَأَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ؛ صَلَاةُ اللَّيْلِ " ».[٤] ئەم فەرموودە پیرۆزە بەڕاشكاوی پێمان دەفەرمووێ: گەورەترین نوێژ دوای فەرزەكان شەونوێژە.

٥. « " إِنَّ فِي الْجَنَّةِ غُرَفًا تُرَى ظُهُورُهَا مِنْ بُطُونِهَا، وَبُطُونُهَا مِنْ ظُهُورِهَا "، فَقَامَ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ: لِمَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: " لِمَنْ أَطَابَ الْكَلَامَ، وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ، وَأَدَامَ الصِّيَامَ، وَصَلَّى لِلَّهِ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ " ».[٥] یەكێک لەو خەسڵەتانەی دەتكاتە نیشتەجێی بەهەشت شەونوێژە.

---

[١]- سنن أبي داود: ٥٠٤٢.
[٢]- سنن النسائي: ١٧٨٦.
[٣]- صحيح البخاري: ١١٢٢.
[٤]- صحيح مسلم: ٦١٠.
[٥]- سنن الترمذي: ٢١١٢.

٦. « " يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ، يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟ " ».[١] كەواتا بەندە لە كاتی بێداری شەودا لە هەر كات لە خودا نزیكترە.

٧. « " لَا حَسَدَ إِلَّا عَلَى اثْنَتَيْنِ؛ رَجُلٍ آتَاهُ اللَّهُ الْكِتَابَ، وَقَامَ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ، وَرَجُلٍ أَعْطَاهُ اللَّهُ مَالًا فَهُوَ يَتَصَدَّقُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ " ».[٢] كەواتا ئەو كەسەی شەونوێژ دەكات و قورئان دەخوێنێ جێگەی ئیرەییە.

٨. « " إِذَا اسْتَيْقَظَ الرَّجُلُ مِنَ اللَّيْلِ وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ، فَصَلَّيَا رَكْعَتَيْنِ كُتِبَا مِنَ الذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ " ».[٣] ئەم فەرموودەیە هانمان دەدا لەگەڵ خۆمان خێزانەكانیشمان بەشدار بكەین لەو بەندایەتییە گەورەیە.

---

[١]- صحيح البخاري: ١١٤٥.
[٢]- صحيح البخاري: ٥٠٢٥.
[٣]- سنن ابن ماجه: ١٣٣٥.

# فکرەی چل و حەوتەم: شەونوێژ بۆ؟

١. لەبەر ئەوەی فەرمانی خودایە چونکە لە دەیان ئایاتدا باسی کردووە، کەواتا ئەمە لە سەرووی هەموو حیکمەتێکە.
٢. دواکەوتنی ڕێوشوێنی پێغەمبەری ئازیزمانە ﷺ بەکردار و بەگوفتار.
٣. پیشەی پیاوچاکانە لە دێرزەمانەوە.
٤. سیفەتی پارێزکارانە.
٥. خۆشی و ئارامی دڵە.
٦. ڕووناکی سیمایە.
٧. بەریبوونە لە دووڕوویی، چونکە مونافیق ناتوانێ بە شەوان قاچەکانی بەرەو قیبلە بکا و پێکانی بچەقێنێ.
٨. هۆکارە بۆ دەورکردنەوەی قورئان.
٩. هۆکارە بۆ باش تێگەیشتن لە قورئان.
١٠. هەر نوێژ خۆی گەورەترین بابەت و عیبادەتە.
١١. نوێژە تەندروستییە.
١٢. هۆڕمۆنی گەشە بەهێز دەکا.
١٣. ئەگەر گریانی لەگەڵدا بێ چاوی دڵ و سەر ڕووناک دەکات.
١٤. شەونوێژ پاداشتی بەهەشتە.
١٥. لە دوای ڕۆژ چاوت ڕوون دەکا.
١٦. شەونوێژکەر دەنووسرێ بە ئەهلی زیکر.
١٧. بە ڕۆژ مرۆڤەکە لە هەموو بەندایەتییەکان چالاک دەبێ.
١٨. فریشتە دەم دەخاتە نێو دەمی و هەموو قورئانخوێندنەکەی لە هەناویدا بۆ هەڵدەگرێ تا قیامەت.
١٩. لە ڕەحمەتی خودا نزیکە بۆ نزاکردن.
٢٠. خودای گەورە بەڵێنی پێداوە لێی خۆشبێ، ئەگەر داوا بکا پێی ببەخشێ ئەگەر بیەوێ.

٢١. لە چەندین نەخۆشی دەپارێزرێ.

٢٢. تاریکی گۆڕی بۆ ڕووناک دەکاتەوە.

٢٣. هەست بە لەززەتی موناجات دەکا.

٢٤. محمد ئیقبال لاهوری شاعیری گەورەی ئیسلام لە خودا دەپاڕێتەوە دەڵێ: ئەی پەروەردگارا لەم دنیایەدا هەر چی لێمی وەردەگریەوە لێمی وەرگرەوە، بەس تکایە کڕوزانەوە و ناڵە ناڵی سەحەرم لێ وەر نەگریەوە.

## فکرەی چل و هەشتەم: پیاوچاکان چییان دەربارەی شەونوێژ وتووە؟

١. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز خەلیفەی دادگەر فاتیمەی خێزانی دەیوت: ئەی موغیرە من دەزانم زۆر کەس هەیە نوێژ و قورئانخوێندنی لە عومەر زیاترە، بەڵام کەسم نەبینیوە هێندە لە خودای خۆی بترسێ، عومەر دەچێتە غورفەکەی خۆی کە بۆ عیبادەتی دانابوو شەونوێژی دەکرد و دەگریا، وەختێک خەوی لێ دەکەوت لە پاشان هەڵدەستا دەستی دەکردە شەونوێژ و دەگریا هەتا بەیانی ئەمە حاڵی بوو، فاتیمە دەڵێ: شەوێک سوڕەتی (القارعه)ی خوێند: ﴿ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ﴿٤﴾ ﴾ القارعة: ٤، هاواری دەکرد و دەیوت: هاوار بۆ سبەی خۆم، مەبەستی دوارۆژ بوو، خەریک بوو ڕووحی دەر بچێ ئەوەندە بەکوڵ دەگریا خودای گەورە لە هەر دووکیان خۆش بێ، فاتیمەی خێزانی دەڵێ: ڕۆژی بۆ خەڵک تەرخان کردبوو شەویش بۆ گریان و فرمێسک لە ترسی خودا.

٢. شەیخی ئیسلام ئیمامی ئەوزاعی شەوی دەکردەوە بە نوێژ و قورئان و گریان، ئافرەتێکی خزمیان سەردانی کرد بینی جێگەیەک تەواو تەڕ بووە، وتی بە خێزانی ئیمامی ئەوزاعی: هاوار بۆ تۆ ئاگات لە منداڵەکات نییە هەتا میزیان لێرە کردووە، وتی: خوشکم ئەوە میز نییە، ئەوە فرمێسکەکانی ئیمامی ئەوزاعییە ڕەحمەتی خودا لە ئەوزاعی، خێزانەکەی دەیوت: بەزەییت بە خۆتدا بێتەوە بۆ وا دەکەی؟ وتی: ئەوانەی بە درێژای شەو دەمێننەوە لە خزمەتی خودادا لە قیامەتدا خودای گەورە ڕاوەستانی ئەوێیان بۆ سووک و ئاسان دەکا، ئەو دوو ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا ﴿٢٧﴾ ﴾ الإنسان: ٢٦ - ٢٧، واتا: وە لە شەوا سوژدەی بۆ بەرە (نوێژ بکە)، وە ستایشی خودا بکە لە بەشێکی زۆر لە شەودا، بێگومان ئەم بێبڕوایانە دنیای بێبەقایان خۆش دەوێ و پشتگوێی دەخەن ڕۆژێکی قورس و گران.

٣. زانای گەورە ئیمام ئەبو حەنیفە: ئەبو عاسیم نەبیل دەڵێ: ئیمام پێیان دەوت: گوڵمێخ، لەبەر پێچەقیوی لە شەونوێژدا، ئیمام لە شەودا ئەوەندە دەگریا بەزەییان پێدا دەهاتەوە، مەشهورە کە ئیمام شەو تا بەیان بە خەبەر بوو، قاسمی کوڕی مەعین دەڵێ: شەوێک ئیمام هەتا بەیانی ئەو ئایەتەی خوێندەوە و دەگریا: ﴿ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوۡعِدُهُمۡ وَٱلسَّاعَةُ أَدۡهَىٰ وَأَمَرُّ ٤٦ ﴾ القمر: ٤٦، واتا: بەڵکو بەڵێنیان ڕۆژی دواییە وە (سزای) ئەو ڕۆژە زۆر سەختتر و تاڵترە.

٤. ئیمامی مالیک: دەبێ حاڵی ئەو پیاوە چۆن بێ کە دەڵێ: هەموو شەوێک پێغەمبەری خودام ﷺ دیوە ڕەحمەتی خودا لەو ئیمامە گەورەیە، ئەو ئیمامەی کە لەنێو شاری مەدینەدا سواری وەڵاخ نەدەبوو، دەیوت پێغەمبەری خودای ﷺ تێدا نێژراوە.

٥. سوفیانی سەوری دەیفەرموو: ئەگەر شەو دێ دڵخۆش دەبم لە خۆشی شەونوێژ، ئیمام ئەوەندە بەپێوە دەمایەوە لە شەودا بەیانی قاچەکانی بەرز دەکردن بۆئەوەی خوێن بگەڕێتەوە بۆ سەرەوەی لاشەی، دەیفەرموو: کە سەرەتای شەو خەوم لێکەوت ڕێگری ناکەم، بەڵام کە هەستام ناخەومەوە تا بەیانی.

نموونە زۆرە لە کۆن و تازەدا، بەڵام ئەمە تەنیا بیرخستنەوەیە، هەر کەس حەز دەکا لەو بوارە شت بخوێنێتەوە و بزانێ با تەماشای کتێبی (رهبان اللیل)ی (د. سید بن حسین العفانی) بکات کە سێ بەرگە.

## فکرەی چل و نۆیەم: بەشێک لە شەونوێژی ئافرەتە ساڵحەکان

١. دایکمان خەدیجە ﵂: کاتێک سوڕەتی (المزمل) دابەزی خودای گەورە شەونوێژی لەسەر پێغەمبەرمان ﷺ پێویست کرد خەدیجە لەگەڵ ئەم ژمارە کەمەی موسوڵمانان شەونوێژیان دەکرد تا پێیەکانیان دەئاوسا. لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی: « جوبرائیل هات بۆ لام، وتی: ئێستا خەدیجە دێ بۆ لات خواردن و خواردنەوەی پێیە بۆت، ئەگەر گەیشت سەلامی پەروەردگار و سەلامی منی پێ بگەیەنە ». دەبێ تۆ چ کەسێکی گەورە بی دایکە ئازیزەکەمان کە جوبرائیل بەتایبەت دێ سەلامی خودات پێ ڕابگەیەنێ، وە سەلامی خۆشی بە تۆ بگەیەنێ و مزگێنی بەهەشتت پێ بدرێ، ئەم پلە و مەقامە بە بەندایەتی و شەونخوونی نەبێ پێی ناگەی.

٢. دایکمان عائیشە ﵂: یەکێک لە تابیعین بە ناوی قاسم دەفەرمووێ: ڕۆژانە سەردانی دایکمان عائیشەم دەکرد، ئەگەر بەیانییان دەچووم لە نوێژدا بوو، دەچوومە بازاڕ دەهاتمەوە چاوەڕوانم دەکرد تا بێتاقەت دەبووم ئەو هەر لە نوێژدا بوو، دەڵێ: ڕۆژێ ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرمووێ: ﴿ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ٢٧ ﴾ الطور: ٢٧، واتا: ئەوەتە خودا منەتی نا بەسەرماندا وە لە سزای دۆزەخ پاراستینی. ئاخر ئەو زۆر باش هەستی بە منەتی خودا دەکرد کە ئیسلامی ناسیوە، کچی ئەبوبەکرە گەورەترین پیاوی ئەو ئیسلامە خێزانی گەورەترین مرۆڤ، وە عائیشە هەموو قورئانی لەبەر بوو، ئیبن عەبباس ﵄ تەرجومانی قورئان و موفەسیری ئەم ئوممەتە دەڵێ: شارەزاترین کەس بە ویتر و شەونوێژی پێغەمبەر ﷺ عائیشەیە ﵂.

٣. حەفصەی دایکمان ﵂: کاتێک پێغەمبەری خودا ﷺ لێی نیگەران بوو بە تەڵاقێک تەڵاقی دا، خودای گەورە جوبرائیلیی نارد فەرمووی بڵێ: ئەی پێغەمبەر ﷺ حەفصە بگێڕێتەوە ژێر نیکاحی خۆی، ( لأنها صوامة قوامة)، چونکە زۆر بەڕۆژووە و زۆر

شەونوێژ دەکا. بەرەکەتی شەونوێژەکەی بۆ هەتا هەتایە لە سایەی سەروەرمانی ﷺ هێشتەوە.

٤. دایکمان زەینەبی کچی جەحش ﵂: لە کاتێک وەفاتی کرد عائیشە دەیفەرموو: ئەو کەسە مرد، سوپاسگوزار بوو، عابدە بوو، پەنای هەتیو و بێوەژنەکان بوو، ئوممو سەلەمە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زۆر پێی سەرسام بوو، زۆر بەڕۆژوو دەبوو، زۆر شەونوێژی دەکرد، زۆر یارمەتی هەژارانی دەدا، ئەوەندە لە شەونوێژدا دەمایەوە حەبلێکی دانابوو کاتێک لەبەر بەپێوەوەستان بێتاقەت دەبوو قورسایی دەخستە سەر پەتەکە، پێغەمبەری خودا ﷺ بەزەیی پێدا هاتەوە و فەرمووی: وا مەکە، چەند دەتوانی عیبادەت بکە (واتا: شەونوێژ)، ئەگەریش نەتتوانی بخەوە.

٥. ئوممو حەسسان الأسديه: سوفیانی سەوری دەفەرمووێ: غورفەیەکی تایبەتی هەبوو، ئەگەر شەو بهاتبا دەرگای لەسەر خۆی دا دەخست، لە وتە جوانەکانی ئەوە بوو دەیوت: ئیلاهی هەر خۆشەویست ئێستا لەگەڵ خۆشەویستەکەی بەتەنیایە، ئەوە منیش لە خزمەت تۆ بەتەنیام ئەی خۆشویستەکەم.

٦. ڕابیعەی عەدەوی بەصری ڕەحمەتی خودای لێ بێ: شەو تا بەیان شەونوێژی دەکرد و فرمێسکی دەباراند، گەورە پیاوانی وەک سوفیانی سەوری پێی سەرسام بوون، دوای بەیانیان دەخەوت، بەڵام بە هاوار خەبەری دەبۆوە و دەیوت: ئەی نەفس چەندە خەوتی ناترسێی بخەوی هەرگیز ڕاست نەبیەوە تا قیامەت.

دەریای فرمیسک بارانی ئافرەتە ساڵحەکان تەواو نابێ، یارب نموونەی ئەمانە هەر زۆر بکەی، بۆیە هەر منداڵێکیان دەبوو وڵاتێکی ئاوەدان دەکردەوە، ئەم ئافرەتە هیممەت بەرزانە لە کوێ و ئەو ئافرەتانەش لە کوێ کە نازانن شەونوێژ چییە؟!!

## فکرەی پەنجایەم: پێغەمبەر ﷺ چۆن شەونوێژی کردووە؟

١. پێغەمبەری خودا ﷺ وەک لە چەندین فەرموودەدا هاتووە لەسەر جێگەیەکی گەرم و نەرم نەخەوتووە تا لە خەودا ڕۆ بچێ، زۆر جار لەسەر حەسیرێ دەخەوت، وە حەسیرەکە جێشوێنی لە لاشەی موبارەکی دەکرد، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە لەوپەڕی ئامادەباشیدا بووە بۆ شەونوێژ.

٢. کە دەچۆ سەر جێگە زیکرەکانی دەخوێندن وەک لە سەرچاوەکانی فەرموودەدا هاتووە، کە دیارە خوێندنی زیکرەکانی کاتی خەو تەواو دەروونی ئینسان ئامادە دەکا بۆ خەوتن.

٣. دیارە خواردنی پێغەمبەری خودا ﷺ نە زۆر بووە نە قورس بووە، چونکە ئەمانە کاریگەرییان بۆ هەستانەوە هەیە.

٤. کە لە خەو هەڵ دەستا بە زیکری خودا دەستی پێ دەکرد، لە چەندین فەرموودەدا هاتووە کە چەندین جۆری زیکری کردووە.

٥. کە لە خەو هەڵ دەستا سیواکی دەکرد.

٦. لە هەندێک فەرموودەدا هاتووە کە کۆتایی سوڕەتی (آل عمران)ی خوێندووە، مەرج نییە بەردەوام وای کرد بێ.

٧. ئەم دوعا و سەنایەی دەخوێند کە زۆر وەئاگاهێن و دڵبزوێنە: « " اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ لَكَ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ الْحَقُّ وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَقَوْلُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ ﷺ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ " أَوْ: " لَا إِلَهَ غَيْرُكَ ". قَالَ سُفْيَانُ: وَزَادَ عَبْدُ الْكَرِيمِ أَبُو أُمَيَّةَ: " وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ " ».[١]

---

١- صحيح البخاري: ١١٢٠.

٨. دەستنوێژێكی پاكی هەڵ دەگرت و تەواو تاراتی دەكرد.

٩. كە دەستی دەكرد بە شەونوێژ دوعای ئیستیفتاحی دەخوێند، ئەوانیش چەند جۆرێكن بە هەر كامێكیان دەست پێ بكەی دەبێ مادام لە سوننەتدا هاتبێ، ئەم دوعایانەش زیاتر ئامادەیی ڕووحی بۆ مرۆڤ دروست دەكەن.

١٠. « عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: مَا كُنَّا نَشَاءُ أَنْ نَرَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي اللَّيْلِ مُصَلِّيًا إِلَّا رَأَيْنَاهُ، وَلَا نَشَاءُ أَنْ نَرَاهُ نَائِمًا إِلَّا رَأَيْنَاهُ ».[١] كەواتا پێغەمبەری خودا ﷺ لە هەموو كاتەكانی شەو شەونوێژی كردووە، وە لە هەموو كاتەكانیشدا خەوتووە، كەواتا بەپێی مەجال و دەرفەتی كەسەكە چۆنت بۆ لوا كە تێیدا شەونوێژ بكەی دروستە، هەتا ئەوانەی كە بەخەبەر نایەن تا فێر دەبن و ڕادێن پێش خەوتنیش شەونوێژ بكەن هەر دەبێ.

١١. پێغەمبەر ﷺ چەند ڕەكات نوێژی كردووە؟ شەونوێژ چەند ڕەكات بكرێ دروستە، ئەگەر حەوت ڕەكات یان نۆ ڕەكات یان یازدە ڕەكات یان سێزدە ڕەكات یان پانزە ڕكات یان لە حەوت كەمتر و لە پازدە زیاتریش بێ هەر دروستە، بەڵام یازدە ڕەكات بە ویترەكەوە بكرێ باشترە، مقۆ مقۆ و موناقەشە لەسەر ژمارەی ڕەكاتەكان هەڵەیەكی گەورەی فقهییە كە كەسێک بیكا.

١٢. بەڵام لە هەموو كاتەكاندا ویتر دەكرێ و زۆر گرنگە.

---

١- سنن النسائي: ١٦٣٨.

## فكرەی پەنجا و یەكەم: چۆنیەتی ویتر كردن

١. ویتر لە سوننەتە هەرە گەورە و گرنگەكانە، لای حەنەفییەكان واجبە، بەڵام فەڕز نییە، چونكە لای ئەوان جیاوازی هەیە لە نێوان واجب و فەڕز.

٢. پێغەمبەری خودا ﷺ سێزدە ڕەكاتی كردوون، بە دوو ڕەكاتی كورت دەستی پێ دەكرد، كەواتا سێ ڕەكات ویتر بووە، دە ڕەكاتیش شەونوێژ بوون.

٣. چۆنیەتی و چەندیەتی ڕەكاتەكانی پێغەمبەری خودا ﷺ:

- سێزدە ڕەكاتی كردوون، هەشتیان دوو دوو، پاشان پێنج ڕەكاتی ویتری كردووە بە یەک تەحیات و سەلامدانەوە.
- یازدە ڕەكاتی كردوون، دە ڕەكاتی دوو دوو، دواتر یەكێكانی دەكردە ویتر، واتا سێ ڕەكات ویتری كردوون، دوویان بەیەكەوە و یەكیان بەتەنیا.
- یازدە ڕەكاتی كردوون، چوار چوار بەیەكەوە، دواتر سێ ڕەكات ویترەكەی بەیەكەوە كردوون.
- یازدە ڕەكاتی كردوون، هەشت ڕەكاتی بەیەكەوە كردوون، لە هەشتەم سەلامی داوەتەوە، دواتر سێ ڕەكاتی كردوون بە تەحیاتێک.
- نۆ ڕەكاتی كردوون، شەشیان بە یەک تەحیات، پاشان دوو ڕەكاتی دیكە، پاشان یەک ڕەكات، دیارە ئەم سێیەی كۆتایی ویتر بوون، بەڵام بە جیا ویترەكانی كردوون.

٤. ویتر كەی دەكرێ؟

- دەتوانی لەدوای نوێژی عیشا دوای سوننەتی ڕاتبە بیكەی.
- دەتوانی كاتی خەوتن بیكەی.
- دەتوانی كۆتایی شەو بیكەی.
- ئەگەر زوو ویترەكان بكەی پێویست ناكا دواتر دووبارەیان بكەیەوە، وە نەهی لێكراوە دووبارەی بكەیەوە.
- ویتر ڕێگر نییە لە شەونوێژ.
- ویتر دەتوانیت یەک ڕەكات بكەی.
- دەتوانی سێ ڕەكات بكەی.

- دەتوانی پێنج ڕەکات بکەی.
- دەتوانی بەسەریەکەوە بیکەی و دەتوانی لێکیان جیا بکەیەوە.

٥. بۆ شەونوێژەکانیش دەتوانی تا هەشت ڕەکات بەسەر یەکەوە بکەی، دەتوانی ئەم هەشت ڕەکاتە بە یەک تەحیات بێ، دەتوانی بە دوو تەحیات بێ، بەڵام دوو دوو باشترە و بێئیشکالترە و خیلافی لەسەر نییە، بەڵام هەموو ئەو شێوازانەی باسمان کرد دروستە و بەڵگەی لەسەرە، ئەگەر کەسێک گومانی هەیە با بڕوانێ بۆ کتێبی (رهبان اللیل) بەرگی یەکەم هەموو ئەوانەی باسکردوون بە بەڵگەوە و تەخریجی فەرموودەکانیشی کردوون.

٦. کەواتا بۆمان ڕوون دەبێتەوە شەونوێژ بەندایەتییەکی بەرفرەوانە، چۆن بۆت گونجا بیکە، بە مەرجێک لە سوننەت دەرنەچێ.

# فکرەی پەنجا و دووەم: تەڕاویح

١. ئایا جیاوازی لە نێوان (قيام الليل) و (تهجد) و تەڕاویحدا هەیە؟

لە ئێستادا بە هەر سێکیان دەوترێ: (قيام الليل)، بەڵام تەڕاویح هەر ئەو شەونوێژەیە کە لە غەیری ڕەمەزان دەکرێ، بەڵام لە ڕەمەزاندا بەجەماعەت دەکرێ و بەپێی توانای نوێژخوێنەکان ئەنجام دەدرێ، (تهجد) ئەوەیە کە بخەوی و هەڵبستیەوە بۆ شەونوێژ، لە ڕاستیدا هەمووی هەر شەونوێژە.

٢. تەڕاویح بەجەماعەت لە ڕەمەزاندا سوننەتە، چونکە پێغەمبەر ﷺ و صەحابە کردوویانە، وە پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمەی بۆ هانداوە و مەدحی کردووە، بۆیە گوێ لەوانە ناگیرێ کە ڕەفزی تەڕاویح دەکەن بەجەماعەت، وە دروستیشە بەتەنیاش بکرێ، پێغەمبەر ﷺ کە نەیکردووە هۆکارەکەی دیار بووە و فەرموویەتی: « " أَنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ " »[١]، بەڵام بە وەفاتی ئەو ئەم گرفتە نەما.

٣. گومان لەوەدا نییە کە ئیمامی عومەر ﷺ ئەم سوننەتی تەڕاویحەی بەجەماعەت زیندوو کردەوە.

٤. زۆربەی زانایان پێیان باشترە تەڕاویح بەجەماعەت بکرێ، بێجگە لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی، ئیمامی عەلی ﷺ دوو ئیمامی دادەنا، یەک بۆ پیاوان و یەک بۆ ئافرەتان، ئوبەییەی کوڕی کەعب ﷺ گەورە قورئانخوێنی هاوەڵان جەماعەتی بۆ دەکردن، دوای هاوەڵان تابعین و زانایان و پێشەوانی دین تا ئەمڕۆش بەجەماعەت تەڕاویح بۆ خەڵک دەکەن، جا کەسێک خۆی حەز دەکا بەتەنیا بیکا ئازادە، بەڵام بۆی نییە بە خەڵک بڵێ: سوننەت نییە یان باش نییە، بەداخەوە ئەم وتە سەیر و سەمەرانە دەبیستین.

٥. چەند ڕەکات بکرێ باشە، کێشە نییە ئەگەر یازدە ڕەکات بێ یان زیاتر بێ، گرنگ ئەوەیە بەچالاکی و دڵخۆشییەوە بێ، نەوەک خەڵک بێزار بکرێ.

---

[١]- صحيح البخاري: ١١٢٩.

٦. ئەوانەی بانگەشەی کۆدەنگی زانایان دەکەن لەسەر یازدە ڕەکات بانگەشەکەیان ڕاست نییە.

٧. ئایا دەکرێ کەسێک بیەوێ لەم یازدە ڕەکاتە زیاتر بکا؟ بەڵێ، هیچ ڕێگرێك نییە و هیچ بەڵگەیەک نییە کە دروست نەبێ.

# فكرەی پەنجا و سێیەم: حوكمی تەوبەكردن و ئەحكامەكانی

١. هەموومان دەزانین ڕەمەزان مەوسیمی تەوبەكردن و گەڕانەوەیە بۆ لای خودای پەروەردگار ئەمە بەئاشكرا دەبینین، خەڵكانێكی زۆر دەبینی دێنە مزگەوت كە پێشتر نەمان بینیون، بۆیە دەبێ ئەم هەلە بقۆزینەوە.

٢. تەوبەكردن واجبە، خودای گەورە لەدوای باسكردنی كۆمەڵێك تاوان دەفەرمووێ: ﴿وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١١﴾ الحجرات: ١١، واتا: هەر كەس تەوبە نەكا ستەمكارە. مرۆڤ لەسەر تەرككردنی شتی سادە بە ستەمكار حیساب ناكرێ.

٣. وە خودای گەورە فەرمانی كردووە كە هەموومان بگەڕێینەوە لای پەروەردگار بۆئەوەی سەربەرز و بەختەوەر بین، كەواتا ئەگەر تەوبە نەكەین بەو ئامانجە ناگەین: ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣١﴾ النور: ٣١.

٤. ئیمامی نەوەوی دەفەرمووێ: زانایان دەفەرموون: تەوبە واجبە لە هەموو تاوانێك، جا ئەو تاوانە پەیوەندی بە مافی خوداوە بێت یان بە مافی خەڵكەوە.

٥. حكم التوبة: قال القرطبي: ﴿إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١٧ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ١٨﴾ النساء: ١٧ - ١٨، اتفقت الأمة على أن التوبة فرض على المؤمنين؛ لقوله تعالى: ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣١﴾ النور: ٣١. وقوله تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا﴾ التحريم: ٨ ، أمر بالتوبة وهي فرض على الأعيان في كل الأحوال وكل الأزمان.

٦. ئایا تەوبەی نەصوح چییە كە لە ئایەتەكەدا هاتووە؟ ئیمامی قورطوبی وتەی زانایان لەو بارەوە نەقڵ دەكا و دەفەرمووێ: اختلفت عبارة العلماء وأرباب القلوب في التوبة النصوح على ثلاثة وعشرين قولا:

- هي التي لا عودة بعدها كما لا يعود اللبن إلى الضرع.
- وروي عن عمر وابن مسعود وأبي بن كعب ومعاذ بن جبل رضي الله عنهم ورفعه معاذ إلى النبي ﷺ. وقال قتادة: النصوح الصادقة الناصحة.
- وقيل الخالصة، يقال: نصح، أي: أخلص له القول. وقال الحسن: النصوح أن يبغض الذنب الذي أحبه ويستغفر منه إذا ذكره.
- وقيل: هي التي لا يثق بقبولها ويكون على وجل منها.
- وقيل: هي التي لا يحتاج معها إلى توبة.
- وقال الكلبي: التوبة النصوح الندم بالقلب، والاستغفار باللسان، والإقلاع عن الذنب، والاطمئنان على أنه لا يعود.
- وقال الكلبي: التوبة النصوح الندم بالقلب، والاستغفار باللسان، والإقلاع عن الذنب، والاطمئنان على أنه لا يعود.
- وقال سعيد بن المسيب: توبة تنصحون بها أنفسكم.
- وقال القرظي: يجمعها أربعة أشياء: الاستغفار باللسان، وإقلاع بالأبدان، وإضمار ترك العود بالجنان، ومهاجرة سيء الخلان.
- وقال سفيان الثوري: علامة التوبة النصوح أربعة: القلة والعلة والذلة والغربة.
- وقال الفضيل بن عياض: هو أن يكون الذنب بين عينيه، فلا يزال كأنه ينظر إليه.
- ونحوه عن ابن السماك: أن تنصب الذنب الذي أقللت فيه الحياء من الله أمام عينك وتستعد لمنتظرك.
- وقال أبو بكر الوراق: هو أن تضيق عليك الأرض بما رحبت، وتضيق عليك نفسك، كالثلاثة الذين خلفوا.
- وقال أبو بكر الواسطي: هي توبة لا لفقد عوض، لأن من أذنب في الدنيا لرفاهية نفسه، ثم تاب طلبا لرفاهيتها في الآخرة، فتوبته على حفظ نفسه لا لله.
- وقال أبو بكر الدقاق المصري: التوبة النصوح هي رد المظالم، واستحلال الخصوم، وإدمان الطاعات.
- وقال رويم: هو أن تكون لله وجها بلا قفا، كما كنت له عند المعصية قفا بلا وجه.
- وقال ذو النون: علامة التوبة النصوح ثلاث: قلة الكلام، وقلة الطعام، وقلة المنام.

- وقال شقيق: هو أن يكثر صاحبها لنفسه الملامة، ولا ينفك من الندامة، لينجو من آفاتها بالسلامة.
- وقال سري السقطي: لا تصلح التوبة النصوح إلا بنصيحة النفس والمؤمنين، لأن من صحب توبته أحب أن يكون الناس مثله.
- وقال الجنيد: التوبة النصوح هو أن ينسى الذنب فلا يذكره أبدا، لأن من صحت توبته صار محبا لله، ومن أحب الله نسي ما دون الله.
- وقال ذو الأذنين: هو أن يكون لصاحبها دمع مسفوح، وقلب عن المعاصي جموح.
- وقال فتح الموصلي: علاماتها ثلاث: مخالفة الهوى، وكثرة البكاء، ومكابدة الجوع والظمأ.
- وقال سهل بن عبدالله التستري: هي التوبة لأهل السنة والجماعة، لأن المبتدع لا توبة له، بدليل قوله ﷺ: « " حَجَبَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ صَاحِبِ بِدْعَةٍ أَنْ يَتُوبَ " »[١]. وعن حذيفة: بحسب الرجل من الشر أن يتوب من الذنب ثم يعود فيه.

٧. بەڵام دەبێ بزانین دەرگای تەوبە داناخرێ تا ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵدێ، وە هەتا گیان دەگاتە قورقوڕاگە.

---

١- شعب الإيمان للبيهقي: ٩٤٥٧.

## فكرەی پەنجا و چوارەم: مەرجەكانی گیرابوونی تەوبە

١. یەكلابوونەوە بۆ خودا، واتا تەوبەكە لەبەر خودا بێ و پاڵنەری تەوبەكە تەنیا ڕەزامەندی خودا و چوونە بەهەشت و دووركەوتنەوە لە دۆزەخ و تورەیی پەروەردگار بێ، نەوەک لەبەر ئەوە بێ عەیبە، یان ڕیشم سپی بووە، یان زۆرم گلەیی لێ دەكەن، یان لە پێگەی كۆمەڵایەتیم كەم دەكا یان ... هتد.

٢. وازهێنان لە تاوانەكە دەستبەجێ.

٣. دانهێنان بە تاوانەكە لە خزمەتی پەروەردگار.

٤. پەشیمانبوونەوە لە دڵەوە، چونكە تەوبەی ڕاستەقینە پەشیمانبوونەوەیە، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێ: « " النَّدَمُ تَوْبَةٌ " ».[١]

٥. گێڕانەوەی مافەكان بۆ خاوەنەكانیان ئەگەر زیندو بوون و مافەكە ماددی بوو، ئەگەر نەمابوو بۆ كەسوكارەكەی، ئەگەر فیتنەی لێ پەیدا دەبوو بە ناوی هەدیەش بۆی بگێڕیەوە دروستە یان بە كەسێكدا.

٦. ئەگەر مافەكە مەعنەوی بوو، وەک ئەوەی باست كردبێ و لە كەسایەتیت دابێ یان شتێكت بۆ هەڵبەستبێ گەردنی خۆتی پێ ئازا بكە، وە ئەگەر نەشمابوو داوای لێبوردنی بۆ لە خودا بكە.

٧. ئەگەر تاوانەكە حەقی خودای گەورە بوو هەموو مەرجەكانی پێشووی هەیە و داوای لێبوردن بكە، ئەگەر تاوانە وازی لێ بێنە، ئەگەر تەركی واجبە بڕۆ ئەنجامی بدە.

٨. ئەگەر لە هەندێک لە تاوانەكان تەوبەی كرد و لە هەندیكی نەیكرد، لەوانە قبووڵە كە تەوبەی لێ كردووە.

٩. دەبێ تەوبەكە لە كاتی خۆیدا بێ، واتا پێش ڕۆژهەڵاتن لە ڕۆژئاواوە و گەیشتن بە گیانەڵا.

١٠. بڕیار بدا نەگەڕێتەوە سەر تاوانەكان، ئەگەر گەڕایەوە دووبارە و سەدبارە تەوبە بكە، تا ڕادێی لەسەر تەرككردنی.

---

[١]- مسند أحمد: ٤٠١٢.

## فکرەی پەنجا و پێنجەم: ئاستەنگەکانی بەردەم تەوبەکردن

١. شەیتان لە دوو ڕێگا لە تەوبەکردندا فێڵمان لێ دەکا، یەکیان دەڵێ: تەوبە مەکە هەر دەگەڕێیەوە بۆ تاوانەکە، ڕێگاکەی دیکە فریومان دەدا بەوەی کە خودا ڕەحمەتی زۆرە، دواتر ئەمانە بەوردی باس دەکەین إن شاء الله.

٢. خودای گەورە دڵنیامان دەکاتەوە لە ڕەحمەت و لێبوردنی خۆی بەرانبەر بەو کەسانەی زیادەڕەوییان کردووە و تەوبە دەکەن: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر: ٥٣، واتا: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە، نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خودا، چونکە بێگومان خودا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت، بەڕاستی هەر ئەو لێبوردەی بەبەزەییە.

٣. لەگەڵ ئەوەشدا کە خودای گەورە داوای تەوبەمان لێ دەکا و بەڵێنی لێخۆشبوونی پێداواین، بەڵام هێشتا شەیتان چەندین داو و تەڵەمان بۆ دادەنێ و فێڵمان لێ دەکا و ئاستەنگمان بۆ دروست دەکا، لەو ئاستەنگانە ئەوەیە.

- دواخستنی تەوبە (التسويف): پێت دەڵێ: جارێ زووە، پەلە مەکە، کاتت لەبەردەستە، هێشتا گەنجی ... هتد، بەڵام دەبێ بەوە وەڵامی نەفس و شەیتان بدەیەوە و بڵێی: ئایا کەس زەمانی ژیانت بۆ دەکا هەتا پیربوون، یان کاتێکی دیکە، وە پێی بڵێ: هەتا زووە تەوبە بکە و خودا لە خۆت ڕازی بکە، کێ دەڵێ تەوبەت بە نسیب دەبێ.
- بێهیواکردن و بێهیوابوون لە ڕەحمەتی خودا (القنوط من رحمة الله): شەیتان پێت دەڵێ: بەو هەموو تاوانەوە چۆن ڕووت دێ داوای لێبوردن لە خودا بکەی، بۆیە تازە وێران بووی ڕەش بووی و بە هیوای لێخوشبوونی خودا مەبە، بەڵام پەروەردگار پێمان دەڵێ: لە ڕەحمەتی خودا بێهیوا مەبن، خودای گەورە لە هەموو تاوانێک دەبورێ، ئایا دەبێ بە قسەی خودای بەڕەحم و میهرەبان بکەین یان شەیتانی مەلعون؟!

- الغرور برحمة الله: جاری وایە بەوە دەمان خەڵەتێنن بەتایبەت بێدین و مولحیدەکان، دەڵێن: ئایا ئێوە ناڵێن: خودا بەڕەحمە، بەبەزەییە؟ ئەی بۆ لێت خۆش نابێ، ئەگەر بە چاکەکردن نەبێ؟ لە وەڵامدا بڵێ: کەسێک بزانێ خودا بەڕەحمە دەبێ بەرەو ڕەحمەت ڕاکا، نەوەک لێی ڕاکا، وە بڵێ: ئێمە هەر چەند چاکە بکەین بارتەقای نیعمەتەکانی خودا نییە، وە بڵێ: ئایا وەڵامی چاکەی خودا بە چاکە دەدرێتەوە یان بە تاوان، ئایا تۆ ئەمە لە منداڵەکانی خۆت قبووڵ دەکەی کە وەڵامی چاکەکانت بە خراپە بدەنەوە؟!
- کاریگەربوون بە دەوروبەری خراپ، جاری وایە کەسەکە لەنێو حیزبێکی خراپ، یان ڕێکخراوێکی خراپ یان کەسانێکی خراپ دەژی و کاریگەر دەبێ بەوان، ئەمە وای لێ دەکا تەوبەکردن بۆ ئەو ئەستەم بێ.
- جاری وایە بەهۆی موسوڵمانە وشک و حاڵی نەبووەکان لە تەوبە و دینداری ڕا دەکا، دەکرێ لە وەڵامی ئەوەدا بڵێی: تۆ بیانو بەوان مەگرە، تۆ دیندارێکی میانڕەو و باش بە.
- بیانوگرتن بە قەدەر: ئەمە زۆر جار بەتایبەت کەسە زۆر تاوانبار و مولحیدەکان بیانوی پێ دەگرن، تاوانبار و مولحیدەکان زۆر بیانو بەمە دەگرن، دەڵێن: مادام خودا نووسیویەتی من چارم چییە، ناتوانم نەیکەم!!

٤. وەڵام بۆ ئەو کەسانە بەو جۆرەیە:

- خودای گەورە ستەم لە بەندەکانی ناکا، وە ستەمکاری خۆش ناوێ، فەرمانی بە دادگەری کردووە، وە پێی فەرمووین کار بکەین، ئەگەر خودای گەورە بەتۆبزی کارێکمان پێ بکا ستەمی لێکردووین.
  - هەمووومان دەزانین کە هەست بە ئازادی دەکەین لە کار و کردەوەکانمان.
  - بۆ خۆمان دەزانین کە درۆ لەگەڵ خۆمان دەکەین.
  - لەو کارانەی پێمان خۆشە پرس بە قەدەر ناکەین.
  - مرۆڤی تاوانبار حەز دەکا پاساو بۆ تاوانەکانی بێنێتەوە و هاوەڵی زۆر بن.
  - ئەی بۆ ناچین نان نەخۆین، بڵێین: قەدەرە!
  - ئەی بۆ واز لە دەوام و کار ناهێنین، بڵێین: قەزا و قەدەرە.
- ئەی بۆ ئەگەر موخالەفەی مرور بکەین ناڵێین: قەزا و قەدەرە و دەپاڕێینەوە و داوای لێبوردن دەکەین.
  - بەردەوام مرۆڤە دۆڕاوەکان بیانو بە قەدەر دەگرن.
  - مرۆڤە سەرکەوتووەکان هەوڵ دەدەن، نەوەک بیانو بگرن.



٥. بێئاگایی: زۆر کەس دەڵێ: من زۆر باشم، نوێژ دەکەم، ڕۆژوو دەگرم، عەیبم چییە؟ واتا بێئاگایە و خۆی بە تاوانبار نازانێ.

## فکرەی پەنجا و شەشەم: چەند ڕێنماییەک دەربارەی تەوبە

١. پەلەکردن لە تەوبە، چونکە عومر کورتە و دیار نییە کەی دەمرین، با فێڵمان لێ نەکرێ و شەیتان فریومان نەدا.
٢. تەوبەکردن وەزیفەی عومرە، چۆن دەبێ تەوبە لەسەر گوناه بکەین، دەبێ تەوبەش لەسەر کەمتەرخەمی بکەین، چونکە ئێمە دەزانین نیعمەتەکانی خودا بەسەرمانەوە لە ژمارە نایەن، ئەدی ئەو چاکانە چۆن وەڵام دەینەوە؟ ئایا دەتوانین؟!
٣. نابێ بێهیوا بین، چونکە بێهیوایی تاوانە، وە جاری وا هەیە لە تاوان دەردەچی و دەچیتە خانەی بێدینی، کەسەکە ئەگەر وای لێ بێ هیوای بە خودا نەمێنێ، ئەمە بێدینییە.
٤. ئەو کەسەی کە تاوانی کردووە و تەوبەی کردووە با بە چاوی ڕابردوو تەماشای نەکەین، با وا بکەین ڕابردوو بەجێ بێڵێ و نابێ وەبیری بخەینەوە، مەگەر بۆ پەند و ئامۆژگاری و شوکرانەی نیعمەت نەبێ.
٥. نابێ ببینە هاوکار و هاوڕێی شەیتان لەسەر ئەو کەسەی تەوبەی کردووە، بەڵکو دەبێ بەندەیەکی باش بین و هاوکار بین لەسەر بەردەوامی لەسەر تەوبەکە و بەردەوام هانی بدەین، وە دڵی خۆش بکەین.
٦. کەسی تەوبەکار نابێ دوای تەوبە هیچ جوڵە و حەرەکەیەکی نەمێنێ و خۆی لە کونجی ماڵ بشارێتەوە و وا بزانێ تەوبە ئەوەیە پەیوەندیت بە کەسەوە نەبێ، بەڵکو هەوڵ بدا چی بۆ خەراپە و شەیتان دەکرد، دەیان ئەوەندە بۆ خودا بکات.
٧. باسی گوناهە شاراوەکانت لای کەس مەکە، چونکە تاوانە پەردەی خودا لەسەر خۆت لا مەبە.
٨. ئەوندە کردەوە بکە کە توانات بەسەردا دەشکێ، زۆر کەس هەن ئەوەندە توندڕەوی دەکەن خۆیان و دەوروبەریان بێزار دەکەن، هەندێک کەس هەیە دەیەوێ بە ماوەیەکی کورت قەرەبووی هەموو ڕابردوو بکاتەوە، ئەمە بۆ زۆر کەس هەڵەیە، دەبێ وردە وردە ڕابردوو بەجێبێڵین.
٩. مرۆڤی تەوبەکار دەبێ هەوڵ بدا بگاتە شیرینایەتی ئیمان، چونکە چێشتنی شیرینایەتی ئیمان مرۆڤ بەردەوام دەکا.

١٠. دەبێ ئەوە بزانین هەموو کەس تاوان دەکا، وا مەزانە کە تەوبەت کرد تازە قەد تاوان ناکەیەوە، بەڵکو تووشی تاوان دەبیەوە، دەبێ دووبارە و چەند بارە تەوبە بکەیەوە.

## فکرەی پەنجا و حەوتەم: بۆچی تەوبە بکەین؟

١. یەکەم لەبەر ئەوەی فەرمانی خودایە، ئەوەندە بەسە بۆ ئێمەی موسوڵمان، جا چ لەوە خۆشترە کە فەرمانی خودا جێبەجێ بکەین.

٢. تاکە ڕێگایە بۆ سەرکەوتن، بۆ بردنەوەی گرەوی ژیان، باشە ئەگەر تەوبە نەکەین چ بکەین؟ بۆ کوێ ڕا بکەین؟

٣. تەوبەکار خۆشەویستی خودایە: ﴿ لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ التوبة: ١٠٨، واتا: هەرگیز نوێژی تێدا نەکەی (ئەی موحەمەد ﷺ) بێگومان مزگەوتێ کە لەسەر بناغەی تەقوا و لەخوداترسان دامەزرابێ لە یەکەم ڕۆژەوە شایستەترە کە نوێژی تێدا بکەیت، پیاوانێکی تێدایە پێیان خۆشە کە خۆیان خاوێن و پاك بکەنەوە، خودایش زۆر پاك و خاوێنانی خۆش دەوێ.

٤. تەوبەکردن هۆکاری چوونە بەهەشتە: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴿٦٠﴾ ﴾ مريم: ٦٠ ، واتا: جگە لەوەی کە تۆبەی کردبێت و باوەڕی هێنا بێت و کاروکردەوەی چاکی کرد بێت، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و هیچ ستەمێکیان لێ ناکرێت و لە پاداشتی کردەوە چاکەکانیان کەم ناکرێتەوە.

٥. تەوبە بەرەکەتی ئاسمان و زەوی دەبارێنێ: ﴿ فَقُلۡتُ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارٗا ﴿١٠﴾ ﴾ نوح: ١٠، واتا: ئەوسا پێم وتن: داوای لێخۆشبوون بکەن لە پەروەردگارتان، بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر لێخۆشبووە: ﴿ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا ﴿١١﴾ ﴾ نوح: ١١، واتا: ئینجا گەر وا بکەن بارانی خوڕەم و لێزمەتان بۆ دەبارێنێ: ﴿ وَيُمۡدِدۡكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ

وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾ نوح: ١٢، واتا: وە سامان و کوڕی زۆرتان پێ دەبەخشێ و باخ و باخاتی زۆرتان پێ دەدات، وە جۆگە ئاوی زۆرتان دەداتێ.

## فكرەی پەنجا و هەشتەم: چۆن بەردەوام بین لەسەر تەوبەكەمان؟

١. یەكەم شت نیەتمان باش بێ و بۆ خودا تەوبە بكەین، نەوەک لەبەر ئیعتباراتی دنیایی.
٢. دەبێ موحاسەبەی نەفسی خۆمان بكەین، بڵێن: ئایە ئەی نەفسی بەدخو چیت دەستكەوتووە لەو تاوانانە.
٣. ترساندنی خۆمان لەو كارەساتەی كە چاوەڕوانمان دەكا لە مردن و سزای قەبر و سزای دوارۆژ و دۆزەخ.
٤. دووركەوتنەوە لەو شوێنەی تاوانی تێدا دەكەین، چونكە لە پەنای شوێنی تاوان ڕزگاربوون لە گوناە زەحمەتە.
٥. دووركەوتنەوە لە هاوڕێی خراپ.
٦. بیركردنەوە لە سەرەنجامی تاوان، ئایا ئەگەر بەردەوام بم چیم بەسەر دێ لای خودا و لای خەڵک.
٧. هەوڵ بدەین بە خەیاڵ بەهەشت و دۆزەخ نیشانی نەفسمان بدەین، پێی بڵێین: ئەی نەفس دەتەوێ بەهەشت بدۆڕێنی و دۆزەخ بكڕی هەی نەزان؟
٨. خۆت سەرقاڵ بكە بە كاری باش و كاتەكانت بە كاری باش پڕبكەوە.
٩. بزانین خودای گەورە ئێمەی خۆش دەوێ مادام یارمەتیداین بۆ تەوبە.
١٠. دەبێ بزانین ئێمە بەهۆی گوناە مردوو بووین، بەڵام خودای گەورە بەهۆی ئیمان و تەوبە گیانی خستینە بەر.
١١. دەزانی ئەی كەسی گوناهبار خودای گەورە لە دڵخۆشی خۆمان بە تەوبەكردنەكەمان خۆشحاڵترە.
١٢. ئایا دەزانی گوناهەكان دەبن بە چاكە بەهۆی تەوبە: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان: ٧٠، واتا: بێجگە لە كەسێ تەوبەی كردبێ و باوەڕی هێنا بێ و كاروكردەوەی

چاكیشی كرد بێت، ئا ئەوانە خودا خراپە و تاوانەكانیان دەگۆڕێت بە چاكە، وە خودا هەمیشە لێبووردەی بەبەزەییە.

١٣. دەبێ ڕاست بین لە تەوبەكەمان، چونكە ئەگەر ڕاست بین خودای گەورە یارمەتیمان دەدا.

١٤. نزاكردن و پاڕانەوە بۆ بەردەوامبوون لەسەر تەوبەكە.

١٥. نابێ لایەنی ترس بەسەر لایەنی هیوادا زاڵ بكەین.

١٦. خۆمان لە شتەكانی ڕابردوو ڕزگار بكەین، ژمارە تەلەفۆنەكان، ڕەسمەكان، شوێنە ئیباحییەكان، هاوڕێ خراپەكان.

١٧. ئەگەر هەستت بە زەحمەت كرد، بزانە كە سەرەتا زەحمەتە، بەڵام دوای باری پێوە دەگری، بزانە ئەگەر پشت بە خودا ببەستی خودای گەورە سەرت دەخا.

١٨. وا تەماشای كۆمەڵگەی ئیسلامی مەكە كە بێتاوانە و دوورە لە تاوان، بۆیە بەهۆی ئەوە پەشیمان مەبەوە.

١٩. هەوڵ بدە هەڵسوكەوتی خۆت بگۆڕە لەگەڵ كەسوكار و هاوڕێ و دایک و باوكت، با هەست بە گۆڕانكاری بكەن، دەست خۆشیت لێ دەكەن و هاوكارت دەبن.

٢٠. مەترسێ كە هاوڕێكانت لۆمەت دەكەن لەسەر لەچک، حجاب، نوێژ ... هتد.

٢١. ئاگات لە نوێژەكان و مزگەوت بێ.

٢٢. مانگی ڕەمەزان بە فرسەت بزانە.

٢٣. هاوڕێی قورئان بە، ئەگەر نەشتزانی بیخوێنییەوە گوێ بگرە.

٢٤. سەردانی قەبرستان و خەستەخانە و نەخۆشەكان بكە، با دڵت نەرم بێ و هەست بە نیعمەتی خودا بكەی.

٢٥. لە شاشە و ئینتەرنێت سەردانی شوێنە باشەكان بكە.

٢٦. با هاوڕێی باشت هەبێ، چونكە چاكترین هۆكارە.

٢٧. ئاگات لە عیبادەتە تایبەتییەكانت بێ، وەک: بەڕۆژووبوون، زیكر، سەدەقە ... هتد.

٢٨. ژیانی زانایان و دانایان و تەوبەكاران بخوێنەوە زۆر كاریگەرە.

٢٩. هەوڵ بدە كاتەكانت ڕێک بخە و ئامانجی دوور و نزیک بۆ خۆت دیاری بكە.

٣٠. پەیوەندی بە كۆمەڵێک یان ڕێكخراوێكی باشەوە بكە، بۆ ئەوەی تووشی هاوڕێ خراپەكانت نەبیەوە.

٣١. بزانە دنیا هەر چەندێک بێ كۆتای پێ دێ، بەڵام قیامەت كۆتای پێ نایە.

٣٢. لە بێدینەكانەوە فێر بە چەند خۆیان ماندوو دەكەن بۆ خراپەكاری، ئەی تۆی تەوبەكار دەبێ بخەوی و بێئاگا بی؟!

٣٣. ئەگەر بکرێ با مامۆستایەکت هەبێ شارەزا لە دین و دنیا، بۆ ئەوەی پرسی پێ بکەی و هاوکارت بێ.
٣٤. زۆر یادی خوداکردن لە هەر شتێک زیاتر دڵت نەرم دەکا، بۆیە دەبێ ئەهلی زیکر بین.
٣٥. با خۆمان لە ڕێچکە و پلانەکانی شەیتان شارەزا بکەین، بۆ ئەوەی فریو نەخۆین.
٣٦. هەوڵ بدە حەماسی و عاتفی نەبی، وە زوو حوکمی کوفر و تاوان بەسەر خەڵکدا مەدە.
٣٧. ئەگەر خراپەت بینی بەپەلە و هەڵەشە مەبە لە لابردنی، چونکە لەوانەیە لەبەر پەلەپەل کارەکە خراپتر بکەی.
٣٨. پێویستە بیر لەوە بکەیەوە تەوبە پڕۆسەیەکی بەردەوامە تا مردن، بۆیە دەبێ وریا و لەسەرخۆ بی.
٣٩. سوود لە تاوانەکانی ڕابردووت وەر بگرە، با لەکونێکەوە دوو جار پێوە نەدرێی.
٤٠. چاک بزانە تاوانەکانت هەر چەند گەورە بووبن لە ڕابردوو ڕێگر نییە کە ببیە پیاوێکی گەورە یان شۆڕەژنێکی گەورە.
٤١. دەتوانی باسی تەوبە بکەی و خۆت بکەیە چیرۆکی جوان و پێشکەشی کۆمەڵگەی بکەی، بۆ ئەوەی ئەوانەی هاوشێوەی تۆن وەک تۆ تەوبە بکەن.
٤٢. ئەگەر ویستت بانگەواز و بانگەشە بکەی بۆ دین، خۆت لە بنچینەکانی دەعوە شارەزا بکە.
٤٣. هەوڵ بدە خۆت فێری زانستی شەرعی بکەی، چونکە زۆر گرنگە.
٤٤. خۆت ئاگادار بکە لە حوکم و مەرجەکانی تەوبە و سوودەکانی، ئومێدەوارم ئەم نووسینە بڕێک هاوکار بێ لەو بوارەدا.
٤٥. هەوڵ بدە زەواج بکەی ئەگەر تا ئێستا نەتکردووە بۆ هەر دوو ڕەگەز، چونکە نیوەی تاوانەکان لە ڕێی شەهوەتەوە تووشت دەبن، هەڵبەت ئەگەر بۆت گونجاو بوو زەواج بکەی و خودای گەورە بۆت ئاسان بکا؟
٤٦. ئەگەر نەفست ویستی تاوانت پێ بکا، پێی بڵێ: دەڵێی چی ئەگەر ئەمڕۆ یان ئەم ساتە کۆتا ڕۆژ و ساتی ژیانت بێ؟
٤٧. ئاگات لێ بێ هاوسەنگی ڕابگرە، هی وا هەیە تەوبە دەکا بەس لە مزگەوتە یان هەموو ڕۆژێ بەرۆژوو دەبێ یان زۆربەی ماڵەکەی دەکاتە خێر، بۆیە پاش ماوەیەکی کەم تووشی بێتاقەتی دەبێ.

٤٨. ئاگادار بە فەتوا لە ئەهلی تەقوا و شارەزا لە دین وەر بگرە، هەر چی وتاری خوێندەوە زانا نییە.
٤٩. هەوڵ بدە سەفرەیەکی ئیمانی بکەی حەج بێ یان عەمرە یان هەر دووکیان.
٥٠. ئاگاداری ڕەوشتمان بین، چونکە بەڵگەی ڕاستی تەوبەکەمان ڕەوشتەکەمانە.
٥١. ئاگاداری تاوانبارەکان بین و ڕێزیان لێ بگرین، چونکە لەوانەیە لە دڵی زۆرێکیاندا تەوبە وەک مەنجەڵ و بورکان قوڵپ بدا، ڕۆژیک دێ بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە و بورکانی گریان لە چاوەکانی دەبارێ، ڕێزگرتن لە بابای تاوانبار باشترین هۆکاری تەوبەکردنە، ئەگەر سفورە یان مەی دەخوا یان هاوڕێی خراپی هەیە، دەبێ زیاتر بەزەییمان پێیاندا بێتەوە.

## فکرەی پەنجا و نۆیەم: وتە جوانەکان دەربارەی تەوبە

١. ئیمامی شافعی دەفەرمووێ:

ولما قسى قلبى وضاقت مذاهبي جعلت الرجا ربي لعفوك سلما

تعاظمني ذنبي فلما قرنته بعفوك ربي صار عفوك أعظم

واتا:

کاتێک دڵم ڕەق بوو ڕێگاکانم لێ وەتەنگ هاتن، ئەی پەروەردگارا هیوا و ئومێدم کردە پەیژە و بۆ لێخۆشبوونی تۆ پێی هەڵگەڕام

تاوانەکانم زۆر گەورە دەبینم، بەڵام لە کاتێکدا بەراوردم کرد بە لێخۆشبوونی تۆ، لێخۆشبوونی تۆ زۆر گەورەتر بوو

لو لم ترد ما أرجو وأطلبه من جود فضلك ما علمتني الطلبا

ئەی پەروەردگارا ئەگەر تۆ نەتەوێ ئەوەی کە لە دڵ و داواکاری منە، هەر لە ئەساسا فێری داواکردن لە خۆت نەدەکردم

إن الملوك إذا شابت عبيدهمو. في رقهم عتقوهم عتق أبرار

وأنت يا خالقي أولى بذا كرما. قد شبت فى الرق فأعتقني من النار

پاشاکان کاتێک کۆیلەکانیان پیر دەبن بە چاکەی خۆیان و بێبەرانبەر ئازادیان دەکەن

ئەتۆ ئەی بەدیهێنەری من زیاتر ئەهلی کەرەمی، وا من پیر بووم لە بەندەیاتیتدا، جا تکایە ئازادم بکە لە ئاگر

٢. شیعرێک بۆ گەنجەکان بۆ هیممەتبەرزی:

شباب الجيل للإسلام عودو. فأنتم روحه وبكم يسود

وأنتم سر نهضته قديما. وأنتم فجره الزاهي الجديد

ئەی گەنجانی ئەم سەردەمە بۆ ئەو ئیسلامە بگەڕێنەوە، ئێوە ڕووحی ئەم دینەن، ئەم دینە بە ئێوە سەروەر دەبێ

لە ڕابردوودا ئێوە هۆکاری هەستانەوە و ڕاپەڕینی ئەم دینە بوون، هەر ئێوەش بەرەبەیانی نوێی ئەم دینەن

## فکرەی شەستەم: چیرۆکی تەوبەکاران

دەیان و سەدان و هەزاران و ملیۆنان کەس چیرۆکی تەوبەی خۆیان هەیە هەر کەس بە شێوەیەک.

کەسێکی ئەمریکی ڕۆژێک لە ڕۆژان بە خەیاڵیدا نەدەهات کە ببێتە موسوڵمان، ئەو لە کۆمپانیایەکی ئەمریکی کاری دەکرد و زۆر جدی بوو، زۆر سەرکەوتوو بوو، چەندین بڕوانامە و هاندانی پێدرابوو لە هەمبەر سەرکەوتنی لە کارەکانیدا.

لە سەفەرێکدا هات بۆ ریاض بۆ سعودیە بەهۆی کارەکەی، دەڵێ: هەموو هەم و غەمم ئەوە بوو کە سەرکەوتوو بم لە کارەکەمدا و پلەکەم بەرز بکرێتەوە، ڕۆژێک زۆر بەئیسراحەت لە شوێنێک دانیشتبووم، مەنزەرەیەکی سەرنجڕاکێشم بینی کە پێشتر نەمبینی بوو، لە نزیک مزگەوتێک بووم دەنگی بانگ هات، بینیم موسوڵمانان بەپەلە بەرەو مزگەوت دەڕۆن، هەتا ئەگەر پێویستت بە شتێک بایە لە دوکانێک دەیان وت: دوای جەماعەت وەرەوە ئێمە دەچین بۆ مزگەوت، لە دڵی خۆمدا وتم: باشە ئەوانە بۆ وا دەکەن، بەلامەوە زۆر جێگەی پرسیار بوو، منیش بەدوای بانگەکەدا چووم بۆ مزگەوت، قامەت کرا و ئیمام سەلامی دایەوە و خەڵکی هەستان بۆ چوونەدەر و دەستیان کرد بە تۆقە و سەلامکردن و بە ڕووی گەشەوە بەیەکەوە پێ دەکەنین، ئەمە یەکجار سەرنجی ڕاکێشام، لە دڵی خۆمدا وتم: بەڕاستی ئەمە سیستەمێکی زۆر جوانە، ئەمە سەرەتای هۆکاری موسوڵمانبوونی من بوو، دەڵێ: لەگەڵ هاوڕێ موسوڵمانەکانم دەستم بە قسەکردن کرد، وتم: بەڕاستی هەرگیز پێشتر شتی وام نەبینیوە، وە هەرگیز ئەوەندە کاریگەر نەبووم، دیارە ئەو ئەمریکییە سپی پێستە موسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند و زۆر بەکوڵ سەردانی مزگەوتی دەکرد و بەشداری جەماعەتەکانی دەکرد، لەدوای دوو مانگ وتی: دەمەوێ بۆ عەمرە سەردانی ماڵی خودا بکەم، لەگەڵ دوو هاوڕێی موسوڵمانی سەردانی کەعبەی کرد بە مەبەستی عەمرە لەوێ، زۆر بەئیشتیاقەوە نوێژ و جەماعەتەکانی دەکردن، زۆر دەگریا و ملکەچ لە خزمەتی خودا ڕادەوەستا، زۆر هەوڵی دەدا لە ڕیزی یەکەم لە نزیک ئیمام نوێژ بکا، ڕۆژێک لە نوێژی خەوتنان لە تەحیاتی یەکەم هەڵنەستایەوە، هەر بەدانیشتنەوە لەسەر شێوەی تەحیات لە نوێژدا مایەوە، هاوڕێکانی دەڵێن: وتمان: دیارە لە جەوی ڕووحی خۆیدا بێئاگا بووە،

بۆیە هەڵناستێتەوە، بەڵام کە نوێژمان تەواوکرد دەستمان لێدا ئەو بەلادا کەوت، ئەوە ئەم ڕووحەیە کە بەڕاستی پەیوەندی بە خوداوە دەکا و خۆشی دەوێ، بەڕاستی بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە.

دوای ئاگادارکردنەوەی کەسوکار و هاوڕێکانی لە قەبرستانی حەڕەمی پیرۆز ناشتمان، هاوپیشەکانی کە مەسیحی بوون، وتیان: بەڕاستی ئێرەیی پێ دەبەین کە لە پیرۆزترین شوێندا مرد کە بڕوای پێیەتی.

یا ڕەب تەوبەت لەو پیاوە باشە قبووڵ کرد بێ و ئێمەش ڕێنمایی بکەی بۆ کردەوەی باش و تەوبەی ڕاستەقینە.

## فکرەی شەست و یەکەم: ئەمڕۆ زۆرترین تاوان لە ڕێی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان تووشمان دێ

ئادابەکانی بەکارهێنانی مۆبایل:

١. بە نیعمەتی خودای بزانین و لە چاکەدا بەکاری بێنین، چونکە شوکری نیعمەت ئەوەیە نیعمەتەکە بە هی خودا بزانی، وە دانی پێدا بێنی، وە لە چاکەدا بەکاری بێنی.

٢. لە کاتی نوستن و کاتی ئیسراحەت تەلەفۆن بۆ خەڵک نەکەی.

٣. لە کاتی چوونە نێو مزگەوت و چوونە سەر ئاو و کاتی نەگونجاو بەکار نەهێنرێ.

٤. ئەگەر جارێک زەنگت لێدا چاوەڕێ بکە و یەکسەر دووبارەی مەکەوە.

٥. زەنگێکی وا دابنێ بێزارکەر نەبێ.

٦. ورد بە، بەهەڵە و بەبێ دڵنیابوون ژمارە تەلەفۆن بەکار مەهێنە.

٧. نوکەجەڕەس مەکە مەگەر زەرور بێ و وەحدەت پێ نەبێ.

٨. قسە و گفتوگۆی بێسوود مەکە، چونکە مۆبایل بۆ پێویستییە.

٩. ئەگەر کەسی بەرانبەر نەتی ناسی، خۆتی پێ بناسێنە با گومانی خراپ نەکا.

١٠. لە کاتی سەیارە لێخوڕین مۆبایل بەکار مەهێنە، چونکە مۆبایل زیاتر لە (٪ ٤٠)ی زاکیرە و تەرکیزت دەبا، بۆی هەیە ئەگەر هەواڵی ناخۆش یان زۆرخۆش ببیستی سەیتەرەت بەسەر خۆتدا نەمێنێ، ئەوکات تووشی کارەسات دەبی.

١١. با شاشەی مۆبایلەکەت وێنەی ناشەرعی لەسەر نەبێ.

١٢. ئایەت و بانگ و شتی ئاینی مەکە بە جەڕەس، چونکە جاری وایە تۆ لە حەمامی یان لە سەرئاوی.

١٣. مۆبایلەکەت مەخەرە دەستی منداڵ، وێڕای ئەوەی کە زیانبەخشە، خەڵک بێزار دەکا و پێی مومدمن دەبێ و بێزارت دەکا لە دانیشتن و کۆڕ و کۆبوونەوەدا.

١٤. دەنگی خەڵک تۆمار مەکە بەبێ پرسی خاوەنەکەی، چونکە دەچێتە خانەی جاسوسی کە حەرامە.

١٥. ئەگەر لە نوێژدا بووی و زەنگت بۆ هات دەستبەجێ بێدەنگی بکە، بەوە نوێژەکەت نابڕێ، بەڵام نوێژخوێنەکان بێزار بکەی گوناهە.

١٦. مۆبایلی کەس بەکار مەهێنە بەپێ پرسی خاوەنەکەی، ئەگەر کەسی نزیکشت بێ.

١٧. ئەگەر ناچار بووی لە کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا مۆبایلەکەت بەکار بێنی، زۆر ڕەچاوی هاوکۆڕەکانت بکە، یان بڕۆ بۆ دەرێ یان زۆر دەنگت نزم بکە.

١٨. مۆبایل بۆ خۆدەرخستن و شانازی و پۆزلێدان و دڵی هەژار شکاندن نەبێ، چونکە ئەوکات حەرامە.

١٩. لە کاتی قسەکردن هەست بە چاودێری خودا بکە و شتی خراپ مەڵێ و مەکە.

٢٠. بە شێوەیەکی گشتی بەدەنگی نزم قسە بکە، چونکە خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ١٩ ﴾ لقمان: ١٩، واتا: وە لە ڕۆیشتندا مامنێوەندی بە (نە هێواش بە نە بەپەلە)، وە (لە قسەکردندا) دەنگت نزم بکەرەوە، بەڕاستی ناخۆشترینی دەنگەکان دەنگی (سەرەی) گوێدرێژە.

٢١. مۆبایل زۆر لایەنی باشی هەیە، وەک:

- دەتوانی زۆر بەئاسانی لە کاتێکی کەمدا بۆ هەر شوێنێک بتەوێ پەیوەندی بکەی.
- کاتێکی زۆرت بۆ دەگێڕێتەوە.
- هۆکارێکی خێرای گواستنەوەیە لەنێو خەڵکدا.
- دەتوانی وەک بەشێک لە سیلەی ڕەحم بەکاری بێنی.
- دەتوانی لە کاتی هەست کردن بە مەترسی دامودەزگا پەیوەندیدارەکان ئاگادار بکەیەوە.
- هۆکارێکی باشە بۆ بازرگانیکردن.
- دەتوانێ پارە و پول و کات بگێڕێتەوە بۆ هاوڵاتی و وڵات.
- بەکاردێ بۆ خوێندن، ملیۆنان کەس بە ئۆنلاین لە ڕێی ئەم مۆبایلەوە دەخوێنن.
- بۆ کاتی نوێژەکان ئاگادارت دەکاتەوە ئەگەر بتەوێ.
- بەردەوام ئاگات لە ڕۆژ و مانگ و ساڵە.
- هۆکارێکە بۆ فێربوونی قورئان.
- نەخوێندەوارەکان دەتوانن گوێ لە قورئان بگرن ئەگەر نەشزانن بیخوێننەوە.
- ئەمڕۆ زۆر گرنگە بۆ کاری بانگەواز بە هەموو شێوەکانی.
- دەتوانی ڕەخنەگرێکی باش بی بۆ هەڵەکانی کۆمەڵگە و دەسەڵات، بەڵام بە ئامانجی چاکسازی.
- بۆ خۆی کامێرایەکی بێ مەسرەفە بۆ یادگارییەکانت.
- حاسیبەیەکی زۆر خێرایە.

- ئەرشیفی زانیارییەکانتە.
- وەک لایت بەکاردێ.
- دەکرێ هۆکارێکی باش بێ بۆ پرسیار و وەڵامی شەرعی.
- مەکتەبەیەکی گەورەیە ئەگەر بتەوێ.
- دەتوانی بۆ هەموو شوێنێک بیگوازیەوە.
- تۆمارکردنی فیدیۆ و دەنگی پێویست.
- بۆ دەزگا هەواڵگرییەکان دەتوانن لە ڕێیەوە ئاسایشی وڵات بپارێزن، بەڵام نەوەک بۆ بێزارکردن و هەڕەشە لە خەڵک و تۆقاندن.
- لەجیاتی تەلەفزیۆن و کەناڵە ئاسمانییەکان بەکاردێ.
- لەجیاتی ڕادیۆ بەکاردێ.
- بۆ تەعاروف و یەکدی ناسین بە کاردێ.
- لێیەوە فێری زمانەوانی دەبی.
- دەکرێ لێیەوە شۆڕشی فکری و مەعریفی و نارەزایی بکرێ دژی ستەمکاران.
- دەکرێ لێیەوە هاوکاری بۆ هەژاران و دەزگا خێرخوازییەکان کۆ بکرێتەوە.
- دەکرێ ڕۆژانە ئاگات لە ڕووداوەکانی هەموو دنیا و ناوچەکەکە بێ.
- دەکرێ لێیەوە فێری پیشە و کاری باش بی.
- دەتوانرێ ڕێیەک بێ بۆ زواج، بەڵام ئەم بوارە ترسناکە و پڕ ئاریشەیە، دەبێ وریا بین.

٢٢. لایەنە خراپەکانی موبایل، وەکو:
- فەخر و شانازی پێکردن.
- ئیسراف و زیادەڕەوی.
- بێزارکردنی خەڵک.
- کاری ئیباحی و بەرهەڵدایی.
- جاسوسی و بەدو عەیبی خەڵک کەوتن.

## فکرەی شەست و دووەم: ئادابەکانی ڕۆژوو

١. ڕەمەزان سەید و گەورەی هەموو مانگەکانە، دەبێ بیقۆزینەوە بۆ کاری خێر.
٢. مەرج نییە کە دەڵێین: ئاداب، هەمووی هەر سوننەت بێ، هەیە فەڕزە هەیە سونەتە هەیە ڕێگاپێدراوە.
٣. نیەتهێنان بۆ ڕۆژووی فەڕز پێویستە، با لەبیرمان نەچێ.
٤. بەڕۆژوو نەبوونی ڕەمەزان بەبێ بیانو تاوانێکە قەرەبوو ناکرێتەوە: « " مَنْ أَفْطَرَ يَوْمًا مِنْ رَمَضَانَ فِي غَيْرِ رُخْصَةٍ رَخَصَهَا اللَّهُ لَهُ؛ لَمْ يَقْضِ عَنْهُ صِيامُ الدَّهْرِ " ».[١] واتا: هەر کەسێک یەک ڕۆژوو بەبێ بیانو بشکێنێ لە ڕەمەزان، ئەگەر بەدرێژایی ڕۆژگار بەڕۆژوو بێ بۆی قەرەبو ناکاتەوە.
٥. لە جوانترین ئادابەکان خۆگرتنەوەیە لە قەدەغەکراوەکان: « " الصِّيَامُ جُنَّةٌ " »[٢]، واتا: ڕۆژوو قەڵغانە لەبەردەم تاوانەکان و سزای خودا.
٦. کەسێک واز لە خراپە نەهێنێ ئەوە برسی و تینویە، نەوەک بەڕۆژوو: « " مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ " ».[٣]
٧. لە ئادابەکانی ڕۆژوو پارشێوە، کە زۆر گرنگ و پێویستە.
٨. ئەگەر بانگی مەغریب ببێ بە دڵنیایی، ئەوکات پەلە بکەین لە ڕۆژووشکاندن.
٩. بە خورما بشکێنرێ سوننەتە، وە ڕوتەب باشترینە، ئەگەر نا بە ئاو یان هەر شتێکی دیکە بێ دەبێ، بەڵام ئەمە سوننەتەکەیە.
١٠. وا چاکە خواردنی ڕوتەبەکان تاک بێ.
١١. نزای ڕۆژوو شکاندن: « " ذَهَبَ الظَّمَأُ، وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ، وَثَبَتَ الْأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ " »[٤]. واتا: ئەی پەروەردگارا تینواتییەکەم ڕۆیی و دەمارەکان تەڕبوونەوە، پاداشتەکە مسۆگەر بوو إن شاء الله. کۆمەڵێک دوعای دیکەش هەن هەر کامێکیان یان هەموویان بڵێی هەر دروستە.

---

[١]- سنن أبي داود: ٢٣٩٦.
[٢]- صحيح مسلم: ٢٧٦١.
[٣]- صحيح البخاري: ٧٦٢.
[٤]- سنن أبي داود: ٢٢٥٦.

١٢. ئەگەر نانمان خوارد زیادەڕەوی نەکەین، با دواتر تام لە نوێژ و تەڕاویحەکان بکەین.
١٣. سەخی نواندن بە زانست و ڕەوشت و بەخشین.
١٤. ڕۆژووشکاندنی خەڵک کە بە قەدەر ئەو خێرت دەگات و لەئەجری میوانیش کەم نابێتەوە.
١٥. ئاساییە مرۆڤ دڵخۆش بێ بە هاتنی ڕەمەزان و پیرۆزبایی لە یەکدی بکەین.
١٦. ڕۆژووی سوننەت کەموکورپییەکانی ڕۆژووی فەرز پڕ دەکاتەوە.
١٧. موتابەعەی چوونە نێو ڕەمەزان بکەین و بەدوای مانگدا بگەڕێین.
١٨. منداڵەکانمان ڕاهێنین لەسەر بەڕۆژووبوون بە مەرجێک زیانیان پێنەگا.
١٩. ئەو کەسەی کە لە سەفەردا هیلاک دەبێ بیشکێنێ باشترە، بەڵام ئەگەر هیلاک نەبێ نەیشکێنێ باشترە.
٢٠. ئەگەر حاڵەتی نارەحەتی سەفەر لە کامەیان نزیک بوو حوکمی ئەو وەردەگرێ.
٢١. نەخۆشیش هەمان حوکمی سەفەری هەیە، واتا سێ حوکمەکەی هەیە.
٢٢. کەسێک لە نێوەڕاستی ڕۆژیشدا سەفەری زەروری بۆ پەیدا بوو و زۆر نارەحەت دەبوو، بۆی هەیە بیشکێنێ.
٢٣. ئەگەر لەبیری چوو شتێکی خوارد ڕۆژووی ناشکێ.
٢٤. مادام بەڕۆژووین با بەشدار بین لە جومعە و جەماعەت و تەڕاویح.
٢٥. دڵخۆشکردنی هەژارەکان بە هەموو شێوەیەکی دروست.
٢٦. ڕۆژووی سوننەت ئەگەر لە ڕۆژیشدا نیەت بێنی هەر دەبێ.
٢٧. کەسێک نەیزانی ڕەمەزانە تا نەکەوتە نێو ڕۆژ، با لەو کاتەوە خۆی بگرێتەوە و بۆی حیسابە إن شاء الله.

## فکرەی شەست و سێیەم: ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن، یان ناشکێنن

١. بەڕۆژووبوون بۆ خودا بریتییە لە خۆگرتنەوە لە هەموو ئەو شتانەی کە ڕۆژوو دەشکێنن لە بەرەبەیانی ڕۆژانی ڕەمەزان تا کاتی بەربانگ بە مەرجە شەرعییەکان.
٢. زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەوانەی ڕۆژوو دەشکێنن بریتین لە: خواردن، خواردنەوە، جوتبوون، سووڕی مانگانە و خوێنی منداڵبوون.
٣. بەخاخی ڕەبۆ ڕۆژوو ناشکێنێ بە ڕای بەهێز، چونکە نە خواردنە نە خواردنەوە نە ئارەزوو، تەنیا کردنەوەی هەناسەیە و هیچی دیکە.
٤. حەبی بنزمان ڕۆژوو ناشکێنێ، چونکە تەنیا چارەسەرە بۆ کێشەی دڵ، هیچی دیکە نییە.
٥. سۆنار و نازوری گەدە ڕۆژوو ناشکێنن، چونکە وەک ئەوە وایە پەنجەت بخەیە زارتەوە، بەڵام ئەمیان دەگاتە گەدە، نە خواردنە نە خواردنەوە.
٦. قەترە کە بەکار بێ چ لە چاو، یان گوێ، یان لووت، ئەویش ڕۆژوو ناشکێنێ.
٧. هەر جیهازێک بۆ فەحس و چارەسەر بخرێتە پێش (واتا: دامێن) یان پشتەوە (کۆم) ڕۆژوو ناشکێنێ.
٨. دەرزی لەخۆدان ڕۆژوو ناشکێنێ، مەگەر موقەوی بێ و وزەت پێ بدا.
٩. سڕکردن (تخدير( کە لە ڕێی زار و لووتەوە ئەنجام بدرێ بۆ بێئاگا کردنی نەخۆشەکە ڕۆژووی پێ ناشکێ.
١٠. شوشتنی گوێ یان ددان ڕۆژوو ناشکێنێ.
١١. ئەو کرێم و دەرمان و لەزگانەی کە بەکاردێن ڕۆژوو ناشکێنن.
١٢. شوشتنی گورچیلە خیلافی بەهێزی لەسەرە، بەڵام ئیحتیات بکرێ، چونکە گۆڕانکاری تەواو بەسەر خوێندا دێنێ و هەندێک مەوادی خواردەمەنی تێدایە.
١٣. ئەو شاف و شتانەی کە بەکار دەهێنرێ ڕۆژوو ناشکێنێ.
١٤. خوێن بەخشین و کەڵەشاخ زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن کە ڕۆژوو ناشکێنێ.
١٥. وەرگرتنی خوێن بۆ فحص زیانی نییە.
١٦. بۆنکردنی عەتر و میسک و هاوشێوەکانی ڕۆژوو ناشکێنێ.
١٧. قەستەرە ڕۆژوو ناشکێنێ.

١٨. غەرغەرە بە ئاو یان بە عیلاج ڕۆژوو ناشکێنێ.
١٩. ماچکردنی خێزان ئەگەر تووشی ڕۆژوو شکاندنت نەکا ڕۆژوو ناشکێنێ، واتا نەگاتە حەددی ئاوهاتنەوە و جوتبوون.
٢٠. ددان کێشان ڕۆژوو ناشکێنێ.
٢١. بەڵام هەموو ئەو چارەسەرانەی کە باسمان کردن بخرێنە شەو باشترە و بێئیشکالترە.
٢٢. جگەرە هیچ گومانی تێدا نییە کە ڕۆژوو دەشکێنێ، هەروەها نێرگەلە و هاوشێوەکانیان.
٢٣. سەفەرکردن سێ بەشە: یەکەم: ئەگەر زیاد لە پێویست نارەحەت بووی بیشکێنی باشترە بەتایبەت ئەگەر زیانت پێ بگەیەنێ، دووەم: ئەگەر هیچ نارەحەتت نەکا نەیشکێنی باشترە، سێیەم: لە کامەیان نزیکتر بوو حوکمی ئەو وەردەگرێ.
٢٤. نەخۆشیش هەمان سێ حاڵەتی سەفەری هەیە.
٢٥. ئەو نەخۆشانەی کە نەخۆشی بەردەوامن دەبێ پرس بە دوکتۆر بکەن، بەتایبەت کەسێک شەکرەی زۆر بێ یان زۆر دابەزێ، یان فشاری خوێن چ زۆر دابەزێ یان بەرز بێتەوە و پێویستی بە چارەسەر بێ.
٢٦. هەموو نەخۆشییەکانی دیکەش بە هەمان شێوە، دەبێ بەپێی ڕێنمایی دوکتۆری پسپۆڕ و دادگەر و بەدین بێ.
٢٧. کەسێک کە ڕۆژووی پێ ناگیرێ لەبەر پیری یان نەخۆشی فیدیە (مزمن) دەدات.
٢٨. ئافرەتی دووگیان دەبێ بەپێی ڕێنمایی دوکتۆر بکات، هەر کات بڵێ: زیانی هەیە بۆ خۆت یان منداڵەکەت نابێ بەڕۆژوو بێ، وە دواتر دەیگرێتەوە.
٢٩. ئافرەتی شیردەر بە هەمان شێوە ئەگەر ڕۆژوو زیان بە منداڵەکەی بگەیەنێ و منداڵەکەش پشت بەو ببەستێ بۆ ژیانی نابێ بەڕۆژوو بێ.
٣٠. ئەگەر ئافرەتی دووگیان لە پاشان کە شیریش دەدا نەیتوانی لە ماوەی ساڵەکە تا ڕەمەزان هاتەوە بەڕۆژوو بێ، ئەوە فیدیە دەدات، چونکە ئەم ڕۆژووە عیبادەتی ئەم ساڵەیە، ساڵێکی دیکە ڕەمەزانێکی دیکەی تێدایە.
٣١. کەسێک ئیحتلامی بێ ڕۆژووی ناشکێ، مەبەستم لە ڕۆژدا.
٣٢. کەسێک بە بیرکردنەوە لە جوتبوون و بەبێ هیچ کردارێکی خۆخشاندن و باوەشلێدان و ... هتد، ئاوی هاتەوە، ڕۆژووی ناشکێ.
٣٣. کەسێک بەهەڵە شتێک بخوا یان بخواتەوە ڕۆژووی ناشکێ.

٣٤. کەسێک نەیزانی بەڕۆژووە و جوتبوونی کرد، ڕۆژووی ناشکێ، بەڵام هەر کات بە بیری هاتەوە دەبێ دەستبەجێ بکشێتەوە، ئەگەر ئافرەتەکەش لەبیری بوو دەبێ ئاگاداری بکاتەوە، دەنا گوناهبار دەبێ.
٣٥. ئەگەر کەسێک لای تۆ خواردن و خواردنەوەی خوارد لە بیری چووبۆوە، دەبێ ئاگاداری بکەیەوە.
٣٦. ئەگەر کەسێک لە شەودا جەنابەتی کەوتە سەر، با لە ڕۆژدا خۆی بشوا ئاساییە.
٣٧. ئەگەر ئافرەتێک لەپێش بانگی بەیانی پاکبۆوە لە سووڕی مانگانە یان خوێنی منداڵبوون با بە ڕۆژ خوێنی خۆی بشوا ئاساییە.
٣٨. ئەگەر ئافرەتێک پێش مەغریب کەوتە سووڕی مانگانە دەبێ ڕۆژووەکە بشکێنێ.
٣٩. ئەگەر کەسێک سەفەری کرد بەپێی ئەو شوێنەی کە پێیدا تێ دەپەڕێ، یان دەیگاتێ ڕۆژوو دەشکێنێ.
٤٠. ئەو وڵاتانەی کە شەو و ڕۆژیان ئاسایی نییە بەپێی فەتوای وڵاتی خۆیان بەڕۆژوو دەبن و ڕۆژوو دەشکێنن، چونکە لە ئەوروپاش مەرکەز و نێوەندی فەتوا هەن.
٤١. ئەگەر کەسێک تووشی جوتبوون هات لە ڕەمەزاندا، دەبێ کەفارەت بدا، ئەگەر هاتو ڕۆژووەکەیان بە جوتبوونەکە شکاند لای شافعی و حەنبەلییەکان، وە ئایا ئافرەتەکە کەفارەتی لەسەرە یان نا؟ ڕای پەسەند ئەوەیە ئەگەر ئافرەتەکە هۆکار بێ و ئەویش مەبەستی بووبێ کەفارەتەکە لەسەر ئەویشە، ئەگەرنا تەنیا لەسەر پیاوەکەیە.

## فکرەی شەست و چوارەم: لەخزمەت قوڕئاندا، قوڕئان ناو و نێوەڕۆک

١. قوڕئان چییە؟ قوڕئانی پیرۆز لەوە گەورەترە کە پێناسە بکرێ، بەڵام بۆ تێگەیشتن چەند پێناسەیەکیان کردووە، لە هەموویان گشتگیرتر ئەم پێناسەیەیە کە دەفەرمووێ:
القرآن كلام الله، المنزل على نبيه محمد ﷺ، المعجز بلفظه، المتعبد بتلاوته، المنقول بالتواتر، المكتوب في المصاحف، المبدوء بسورة الفاتحة والمختتم بسورة الناس.

٢. قوڕئان خاوەنی چەندین ناو و سیفەتە کە ئێمە هەندێکیانی باس دەکەین، لەوانە:

- القرآن.
- الكتاب.
- الذكر.
- التنزيل.
- الفرقان.

زیاتر بەوانە دەوترێ ناوەکانی قوڕئان.

٣. هەروەها قوڕئانی پیرۆز بە چەندین سیفەت وەسفکراوە، لەوانە:

- آيات.
- بلاغ.
- أحسن الحديث.
- الحق.
- صحف.
- الصدق.
- عربي.
- عزيز.
- عظيم.
- علي.
- القول.
- قيم.

- کلام الله.
- کلمات الله.
- متشابه.
- مجید.
- مهیمن.
- الوحي.

٤. کۆمەڵێک ناوی دیکە مانای بەیان و ئیرشاد دەگەیەنێ کە هەر وەسفی قورئانن:

- بشیر.
- بصائر.
- محکم.
- حکیم.
- حکمة.
- ذکری.
- تذکرة.
- مبین.
- مفصل.
- تفصیل.
- موعظة.
- نذیر.
- هدی.
- خیر.
- رحمة.
- شفاء.
- عجبا.
- کریم.
- مبارك.
- مثاني.
- نور.

٥. ئەم وەسفانە ڕای ڕاست ئەوەیە کە بۆ قورئان بەکار هاتبێ:

- روح.

- شاهد.
- العلم.
- القصص.
- مسطور.
- نبأ عظیم.

٦. ئەمانەش لێکدراونەوە بە وەسفی قورئان، بەڵام زۆر یەکلاییکەرەوە نییە:

- إمام.
- برهان.
- حبل الله.
- داعي الله.
- الزبور.
- صراط مستقیم.
- الطیب.
- العروة الوثقی.
- الغیب.
- فضل الله.
- رحمة الله.
- الکوثر.
- مناد.
- المیزان.
- النجوم.

وەک وتمان ئەوانە زیاتر بە واتای غەیری قورئان بەکارهاتوون، واتا ڕای پەسند ئەوەیە وەسفی قورئان نین، هەر چەند هەندێک لە ڕاڤەکارانی قورئان وایان وتووە.

٧. ئەو ناوانەش خیلافیان لەسەرە کە وەسفی قورئان بن، بەڵام ڕێگر نییە کە بەو واتایەش لێک بدرێتەوە:

- الأثارة.
- أمر الله.
- تبصرة.
- الحجة.
- الرسالة.

- سبيل الله.
- شرعة ومنهاجا.
- القسط.
- النعمة.

گومان لەوەدا نییە کە هەموو ئەو ناو و سیفەتانە چ ئەوەی یەکدەنگی لەسەرە، چ ئەوەی ڕاجیایی لەسەرە بەجوانترین شێوە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوونە دی.

# فكرەی شەست و پێنجەم: ئەدەب لە خزمەت قورئانی پیرۆزدا

١. نیەتی خۆمان لەخزمەت قورئانی پیرۆزدا یەكلا بكەینەوە، ئیخلاص بۆ خودا ڕووحی هەموو كارە باشەكانە، هۆكاری بەرزبوونەوەی كردەوەكانە.
٢. داوای پاداشتكردن لە خودا، واتا بۆ ئەوە بیخوێنین پاداشتی لای خودامان هەبێ، كە بە هەر پیتێك دە چاكەمان بۆ دەنووسرێ.
٣. بەدەستنوێژ و بەپاكییەوە قورئان بخوێنین.
٤. وا چاكە ڕوو لە قیبلە بكەین دەنا واجب نییە.
٥. ئەگەر بكرێ بەدانیشتنەوە بیخوێنین.
٦. پێشتر سیواک بكەین.
٧. بەتەجویدەوە قورئان بخوێنین.
٨. دەنگی خۆمان خۆش بكەین بەپێی توانا.
٩. لەگەڵ ئایەتەكانی قورئاندا كاریگەر بین.
١٠. گریان زۆر باشە و ئادابێكی گەورەیە لە خزمەت قورئاندا.
١١. وردبوونەوە و تێڕامان.
١٢. لە سەرەتا (أعوذ باالله) و (بسم الله) كردن.
١٣. بەدەنگ بیخوێنین.
١٤. بەدڵێكی تەواو و ئامادە قورئان بخوێنین.
١٥. زیادەڕەوی نەكردن لە تەجویدی قورئان، بە حەددێک هیچ خۆشی و نەغمەیەكی نەمێنێ.
١٦. لە سێ ڕۆژ كەمتر قورئان خەتم نەكرێ، مەگەر بۆ كەسانێک زۆر ماهیر و بەتوانا بن.
١٧. زوو زوو بەسەركردنەوە و دووبارە كردنەوەی ئەوەی لەبەرمان كردووە.
١٨. كاركردن بە قورئان.
١٩. گەیاندن و خزمەتكردنی قورئان.
٢٠. فێربوون و فێركردنی قورئان.

٢١. بەرگریکردن بە هەموو شێوەیەک لە قورئان.
٢٢. داوا نەکردنی دنیا بە قورئان.
٢٣. ئەو کاتانە قورئان بخوێنین کە دڵمان لەسەریەتی.
٢٤. پارێزگاریکردن لەو ئایەت و سورەتانەی کە ویرد و سوننەتە.
٢٥. ئەگەر بکرێ بەکۆمەڵ قورئان بخوێنین یان جار جار وا بکەین باشە.
٢٦. لە مزگەوتدا باشترە.
٢٧. لەنێو نوێژدا قورئان خوێندن زۆر باشترە.
٢٨. بەگەورەگرتنی قورئان چونکە دروشمی دینە.
٢٩. بەرزبوونەوە بەهۆی قورئانەوە.
٣٠. هەموو هۆکارەکانی تێ نەگەیشتن و ورد بوونەوەی قورئان لا ببەین.
٣١. وا بزانی کە قورئان تەنیا بۆ خۆت دابەزیوە.
٣٢. شەرمکردن لە خاوەنی قورئان.
٣٣. لە کاتی قورئان خوێندن خۆسەرقاڵ نەکردن بە مۆبایل و تەلەفزیۆن و شتی دیکە.
٣٤. گوێگرتن لە قورئانخوێنەکان، بۆ ئەوەی هەڵەکانی خۆت ڕاست بکەیەوە و سوودیش لەوان وەر بگری.
٣٥. ڕێز بگرین لە ئەهلی قورئان.
٣٦. هەڵسوکەوتمان قورئانی بێت.
٣٧. ڕێز لەوانە بگرین کە دێن بۆ قورئان خوێندن.
٣٨. لانی کەم خوێندنەوەی ئەو تەفسیرانەی کە تەنیا تەرجەمەی قورئانن.
٣٩. دوعاکردن بۆ ئەوەی ئەهلی قورئان بین، وە لەژێر ئاڵای قورئاندا حەشر بکرێین.
٤٠. گرنگیدان بە مەدرەسە و نێوەندەکانی قورئان خوێندن.

## فکرەی شەست و شەشەم: ئەرکەکانمان بەرانبەر قورئانی پیرۆز

١. جوان خوێندنەوە.
٢. جوان تێگەیشتن.
٣. جوان کارپێکردن.
٤. جوان گەیاندن.
٥. جوان بەرگری لێکردن و وێناکردن.

## فکرەی شەست و حەوتەم: ئامانجە گشتی و سەرەکییەکانی قورئانی پیرۆز

- تەوحید.
- تەزکیە.
- تەعمیر.

یەکەمیان: حەقی خودایە.

دووەمین: حەقی مرۆڤەکانە.

سێیەمیان: حەقی ژیان و ژینگەیە.

بە هەر سێکیشیان هەر چی قازانجی دین و دنیامانە دەستمان دەکەوێ، وە هەر چی زیانی دین و دنیا و دوارۆژە لێمان دوور دەکەوێتەوە.

## فکرەی شەست و هەشتەم: دانانی لەوحەیەک (سەبورەیەک)

زۆر گرنگە لەوحەیەک (سەبورەیەک) لە مزگەوتدا هەڵ بواسرێ زۆرترین خەڵک ببینێ، ڕۆژانە فەرموودەیەکی بە تەرجومەی کوردییەوە لێ بنووسرێ، بەتایبەت ئەو شتانەی کە هاندانە و پەیوەندی بە ڕەمەزان و ڕۆژوو و سەدەقە و لێبوردەیی و ڕەفتاری جوانەوە هەبێ، ئەمە دەعوەیەکی بێدەنگە کە زۆربەی نوێژخوێنە خوێندەوارەکان دەیخوێننەوە، وە لەوانەیە لەسەر ئەمە پرسیاریان لا دروست بێ و ببێتە هۆکار بۆ شارەزابوونی زیاتر لە ئیسلام و زیاتر یەکدی ناسین، ئەمە فکرەیەکی سەرکەوتووە ئیمامە بەڕێزەکە دەتوانێ ئەمە بە کەسێک بسپێرێ و خۆی فەرموودەکەی بۆ دیاری بکا.

# فکرەی شەست و نۆیەم: گەورەیی قورئان خوێندن

١. قورئان و قورئان خوێندن گەورەترین ڕەحمەت و بەخششی خودایە، بۆیە دەبێ دڵمان پێی خۆش بێ: ﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ٥٨ ﴾ یونس: ٥٨.

٢. قورئان خوێندن یەکێکە لە گەورەترین بازرگانییەکان: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ يَرۡجُونَ تِجَٰرَةٗ لَّن تَبُورَ ٢٩ ﴾ فاطر: ٢٩، واتا: بەڕاستی ئەوانەی کە کتێبی خودا دەخوێننەوە و بەچاکی نوێژیان بەجێهێناوە، وە لەوەی کە پێمان داون بە نهێنی و ئاشکرا دەبەخشن چاوەڕوانی بازرگانییەکن هەرگیز زەرەر ناکات.

٣. ئەهلی قورئان ئەهلی خودایە: « قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنَ النَّاسِ "، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ هُمْ؟ قَالَ: " هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ، أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ " ». سنن ابن ماجه.[1]

٤. قورئان خوێندن ناو و ناوبانگە لە ئاسمانی زەوی: « عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه، أَنَّ رَجُلًا جَاءَهُ فَقَالَ: أَوْصِنِي. فَقَالَ: سَأَلْتَ عَمَّا سَأَلْتُ عَنْهُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنْ قَبْلِكَ، أُوصِيكَ بِتَقْوَى اللَّهِ؛ فَإِنَّهُ رَأْسُ كُلِّ شَيْءٍ، وَعَلَيْكَ بِالْجِهَادِ؛ فَإِنَّهُ رَهْبَانِيَّةُ الْإِسْلَامِ، وَعَلَيْكَ بِذِكْرِ اللَّهِ، وَتِلَاوَةِ الْقُرْآنِ؛ فَإِنَّهُ رَوْحُكَ فِي السَّمَاءِ، وَذِكْرُكَ فِي الْأَرْضِ ».[2]

٥. ئەو کەسەی قورئان فێر دەبێ و خەڵکی فێر دەکات باشترین کەسە: « " خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ " ».[3]

---

[1]- سنن ابن ماجه: ٢١٥.
[2]- مسند أحمد: ١١٧٩١.
[3]- صحيح البخاري: ٢٠٢٨.

٦. قورئان تکاکارە بۆ خاوەنەکەی: « " اقْرَءُوا الْقُرْآنَ؛ فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لِأَصْحَابِهِ، اقْرَءُوا الزَّهْرَاوَيْنِ: الْبَقَرَةَ وَسُورَةَ آلِ عِمْرَانَ؛ فَإِنَّهُمَا تَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ، تُحَاجَّانِ عَنْ أَصْحَابِهِمَا. اقْرَءُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ؛ فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ، وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلَا تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ ". قَالَ مُعَاوِيَةُ: بَلَغَنِي أَنَّ الْبَطَلَةَ: السَّحَرَةُ ».[١]

٧. سوڕەتی (البقرة) و (آل عمران) لە شێوەی دوو پەڵە هەور، یان سێبەر، یان دوو پۆلە تەیر بەرگری دەکەن لە خاوەنەکانیان.

٨. مرۆڤی موسوڵمان بەهۆی قورئان بەرز دەبێتەوە: « " إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْقُرْآنِ أَقْوَامًا وَيَضَعُ آخَرِينَ " ».[٢]

٩. ئەو کەسەی قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە لە قیامەتدا هەر ئایەتێک بخوێنێ بەرزتر دەبێتەوە: « قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ: اقْرَأْ وَارْتَقِ، وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا؛ فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا " ».[٣]

١٠. ئەو کەسەی لە قورئان ماهیر و شارەزایە، لەگەڵ فریشتە بەرز و بەڕێزەکاندایە: « " الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ " ».[٤]

١١. ئەو کەسەش کە گرنگی بە دەنگی دەدا و دەیەوێ قورئان لای خەڵک جوان بکا و خۆشەویستی بکا هەر لە هەمان پلەدایە: « " زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ " ».[٥]

١٢. بەرەکەتی قورئان ئەوەندە بەسە کە بە هەر پیتێک دە خێرت بۆ دەنووسرێ: « " مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لَا أَقُولُ: الم حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ، وَلَامٌ حَرْفٌ، وَمِيمٌ حَرْفٌ " ».[٦]

١٣. هەر کەس حەز دەکا خودا و پێغەمبەر ﷺ خۆشیان بوێ با لە مصحف قورئان بخوێنێ.

١٤. تەنانەت تەماشاکردنی قورئانیش عیبادەتە.

١٥. ئەوەی کە منداڵەکەی قورئانخوێنە لە قیامەتدا تاجی ڕێز و ویقاری لەسەر دەکرێ و بە جۆرەها جلوبەرگی ئاوریشم و تایبەت دەڕازێنرێتەوە.

---

١- صحيح مسلم: ٢٥٢.
٢- سنن الدارمي: ٣٤٠٨.
٣- سنن أبي داود: ١٤٦٤.
٤- صحيح البخاري: ٢٧٥١.
٥- صحيح البخاري: ٢٧٥١.
٦- سنن الترمذي: ٣١٥٨.

## فکرەی حەفتایەم: ئادابەکانی فێرخواز و فێرکاری قورئان

فێرکاری قورئان زۆر گەورە و بەڕێزە، پێویستە و وا چاکە خاوەنی ئەو ڕەوشت و ئاکارانە بێ:

١. کارەکەی بۆ خودا بێت بۆ ئەوەی دوور بێ لە ڕیا و ڕووپامایی.
٢. قورئان فێرکردن نەکرێ بە پیشەی خۆپێژیاندن، بەڵام ئەگەر کەسەکە هەموو ژیانی بۆ ئەوە تەرخان کرد دروستە هاوکاری بکرێ.
٣. ڕازانەوە بە ڕەوشتی بەرز.
٤. چاکەکردن لەگەڵ فێرخوازەکان.
٥. دەربڕینی دڵسۆزی بۆ فێرخوازەکان.
٦. بەگەورەگرتنی زانست و نەکەردنی بە خزمەتکاری ستەمکاران.
٧. فرەوانکردنی کۆڕی زانست بۆ فێرخوازەکان.
٨. ئادابەکانی فێرخواز:

- بێجگە لە ئیخلاص بەگەورەگرتنی قورئان.
- دڵی خۆ پاککردنەوە لە حەسوودی و کینە و بوغز.
- تەقوا و پارێزگاری.
- سووربوون لەسەر فێربوون.
- خۆڕازاندنەوە بە ئەخلاقی قورئان.
- گەڕان بەدوای مامۆستای زانا و دڵسۆز.
- بەجوانترین شێوە لە خزمەت زانست و مامۆستادا بێ.
- هاوکات هەوڵ بدا بەپێی توانا لەگەڵ فێربوون فێرکاریش بێ.
- بۆ ئامانجی بچووک و دنیای نەخوێنێ، چونکە ئەگەر بۆ خودا بوو هەم دینە و هەم دنیایە.
- ڕەوشتبەرزی لەگەڵ هاورێکان.
- ڕەچاوکردنی ئادابەکانی قورئان.
- زوو ئامادەبوون لە کۆڕی زانست فێربوون.
- بێدەنگی و ویقار زۆر گرنگە، نەوەک هەڵەشەیی و زۆربڵێی.

- هەتا بکرێ ترسان لە خودا و گریان بە کاریگەر بوون بە قورئان.
- شەونوێژ و زیکر و نزای زۆر.
- زۆر خوێندنەوە و ئامادەکردنی دەرسەکان بەجوانی.
- بەڕۆژووبوونی سوننەت زۆر کاریگەرە بۆ زیادبوونی قورئان.
- بەسەرکردنەوە و وتنەوەی قورئان.
- هەر بەزوویی گرنگیدان بە لەبەرکردنی قورئان.
- خوێندنەوەی چەند تەفسیرێکی خاوێن و ڕەوان دەربارەی قورئان.

## فکرەی حەفتا و یەکەم: قورئان و موعجیزە

قورئانی پیرۆز لە چەندین ڕووەوە موعجیزەیە ئاماژە بە هەندێکیان دەکەم:
١. ئیعجازی قورئان لە ڕووی زمانەوانی و ئوسلوب، بۆ ئەوەی لەم بوارە تێ بگەین نموونەیەک دێنینەوە بە ڕستەیەکی عەرەبی:

- أعطى محمد خالدا كتابا.
- محمد أعطى خالدا كتابا.
- خالدا أعطى محمد كتابا.
- كتابا أعطى محمد خالدا.
- كتابا خالدا أعطى محمد.
- أعطى خالدا كتابا محمدا.
- أعطى خالدا محمد كتابا.

لە هەموو ئەمانەدا (محمد) بکەرە (فاعل) پێدەری کتێبەکەیە، وە (خالد) بەرکارە (مفعول)و وەرگری کتێبەکەیە، تۆ وا دەزانی هەموو ئەوانە یەک واتایان هەی، بەڵام لە ڕووی واتاوە جیاوازن:

- رستەی یەکەم بۆ کەسێک دەوترێ کە هیچ زانیارییەکی لەسەر هەواڵەکە نییە، واتا عەرەب گوتەنی (خالی الذهن)ە.
- لە ڕستەی دووەمدا بەرانبەر دەزانێ کەسێک کتێبی داوەتە خالد، بەڵام نازانێ کێیە بۆیە فاعل کە محمدە لەپێشدا باسی کراوە.
- لە ڕستەی سێیەمدا دەزانی محمد فاعلە، بەڵام نازانی مفعول کامەیە، بۆ ئەوەی گومانەکە بڕەوێتەوە سەرەتا مفعول گوتراوە.
- لە ڕستەی چوارەمدا دەزانین فاعل و مفعول کێن، بەڵام نازانین ئەو شتەی دراوە بە خالد چییە، بۆیە ئەو لەپێشدا گوتراوە، بۆ ئەوەی دڵنیا بین ئەوەی دراوە چییە.
- لە ڕستەی پێنجەمدا بەرانبەر (مخاطب) دەزانێ فاعل کێیە، بەڵام مفعولی یەکەم و دووەم نازانرێ، بۆیە ئەوان پێشکەوتوون.
- لە ڕستەی شەشەمدا کتێب پێدراوەکە و کتێبەکە دیار نییە.

❖ لە ڕستەی حەوتەمدا بەس کتێب پێدراوەکە دیار نییە، کە دەڵێین دیار نییە، مەبەستمان ئەوەیە لە سەرەتا دیار نییە، دەنا بەهۆی ڕستەکە هەر دیارە، بەڵام لەم ڕستانەدا دەر دەکەوێ گرنگترین کامەیە.

٢. ئیعجازی ڕەوانبێژی: بەڵگە بۆ ئەمە ئەوەندە بەسە کە کەس نەیتوانیوە ڕەخنەیەکی حەقیقی بگرێ و ئەهلی ئەو بوارە بڵێن: ڕاستە، ئەمە لە قورئاندا بەلاغەی تێدا نییە.

٣. ئیعجازی کاریگەری: لەسەر زەویدا هیچ گومانی تێدا نییە کە پڕکاریگەریترین کتێبە.

٤. ئیعجازی هەمەلایەنی قورئان: کە باسی هەر شتێکی کردووە کە پێویستی مرۆڤایەتی بێ بۆ دین و دنیا و ڕووح و جەستە، تاک و کۆمەڵگە، دین و دەوڵەت ... هتد.

٥. ئیعجازی ژمارەیی کە دەیان و سەدان کتێبی لەسەر نووسراوە.

٦. ئیعجازی مێژوویی.

٧. ئیعجازی فەلەکی.

٨. ئیعجازی پزیشکی.

٩. ئیعجازی تەشریعی.

١٠. ئیعجازی زیندوومانەوە بەکاریگەری.

١١. ئیعجازی عاتفی.

١٢. ئیعجازی جەمال و جوانی.

١٣. ئیعجازی ئابوری.

بەکورتی چ بواری زانستی مرۆیی بێ، یان زانستی تەبیعی بێت، قورئان وا باسی کردووە و حەقی پێداوە.

بواری ئیعجازی زۆر فرەوانە لە قورئانی پیرۆزدا، دەبێ گرنگی پێ بدرێ و بوارێکی زۆر باشە، بەتایبەت لەمرۆدا.

دەتوانرێ بەدرێژایی شەوەکانی ڕەمەزان هەر جارە و باسی ئیعجازێک بکرێ، بەتایبەت بۆ گەنجان و تازەپێگەیشتووان زۆر گرنگە.

## فکرەی حەفتا و دووەم: پلە و پایەی ڕۆژوو

١. گومان لەوەدا نییە زەکات واجبە لە ئیسلامدا، ئەمە ڕاجیایی لەسەر نییە مەگەر کەسێک دژەدین بێ یان نەزان بێ بە دین.

٢. لە هەموو دینە ئاسمانییەکاندا زەکات هەبووە و واجب بووە: ﴿ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٧٣، واتا: وە ئەوانمان کرد بە پێشەوا، بە فەرمانی ئێمە ڕێنموونی (خەڵکییان) دەکرد، وە نیگامان کرد بۆیان ئەنجامدانی کاری چاك و نوێژکردن و زەکاتدان، وە ئەوان هەر بۆ ئێمە عیبادەتیان دەکرد.

٣. یەکێکە لە پایەکانی ئەم دینە: « قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ " ».[1]

٤. کەسێک زەکاتی نەبێ دینی نییە، مەبەست دینداری ڕاستەقینە: ﴿ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ ﴾ التوبة: ١١، واتا: ئەگەر پەشیمان بوونەوە و نوێژیان بەجێهێنا و زەکاتیان دا، ئەوە براتانن لە ئاییندا، وە ئێمە بەڵگەکان ڕوون دەکەینەوە بۆ گەلێك کە دەیزانن.

٥. وەسیەتی خودا بووە بەتایبەت بۆ بەنو ئیسرائیل: ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ

---

[1]- صحيح البخاري: ١٠.

﴿وَأَنتُم مُّعۡرِضُونَ ٨٣﴾ البقرة: ٨٣، واتا: وە بیر بکەنەوە کاتێک کە پەیمانمان لە جوولەکە وەرگرت کە هیچ شتێک نەپەرستن جگە لە خودا، وە چاکە بکەن لەگەڵ دایک و باوک و خزمان و هەتیوان و بێچاران (بەستەزمانان)، وە قسەی جوان بکەن لەگەڵ خەڵکیدا وە نوێژ بکەن وە زەکات بدەن، ئینجا پشتتان هەڵکرد کەمێکتان نەبێت، وە ئێوە بەربەرەکانێکەرن (واتا: پشتهەڵکەرن).

٦. وەسیەتی پێغەمبەر عیسا ﷺ بووە کە هێشتا لە بێشکەدا بووە: ﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيۡنَ مَا كُنتُ وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمۡتُ حَيّٗا ٣١﴾ مريم: ٣١، واتا: وە پیرۆز و فەڕداری کردووم لە هەر جێگەیەکدا بم و فەرمانی پێداوم بە نوێژکردن و بە زەکاتدان هەتا لە ژیاندام و زیندووم.

٧. بەندایەتی ڕاستەقینە بەبێ نوێژ و زەکات نایەتە دی: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ٥﴾ البينة: ٥، واتا: لەگەڵ ئەوەشدا کە فەرمانیان پێ نەدرا بوو مەگەر بەوەی کە پەرستشی خودا بکەن بەدڵسۆزی و ملکەچی بۆ بکەن خۆیان بە دوور بگرن لە هەموو بیروباوەڕێکی خواروخێچ، وە نوێژ بکەن و زەکات بدەن، وە ئەمەیە ئایینی ڕاست.

٨. ئەو کەسانەی بەخشندە نین ئەهلی ئاگرن: ﴿مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ٤٢ قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ٤٣ وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ ٤٤﴾ المدثر: ٤٢ - ٤٤، واتا: پرسیاریان لێ دەکەن بە هۆکاری چییەوە چوونە نێو ئاگر؟ دەڵێن: ئێمە لە نوێژخوێنان نەبووین، وە خۆراکمان نەدەدا بە هەژاران.

٩. هان نەدانی خەڵک بۆ بەخشندەیی سیفەتی کافرانە: ﴿أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ١ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِي يَدُعُّ ٱلۡيَتِيمَ ٢ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ٣﴾ الماعون: ١ - ٣، واتا: ئاخۆ دیت ئەو کەسەی کە بڕوای بە ئایین نییە؟ ئەوە کەسێکە کە پاڵ بە هەتیووە دەنێ، وە هانی خەڵک نادات بۆ خواردەمەنی دان بە هەژاران.

١٠. ئەو کوڕانەی کە بڕیاریان دا وەک باوکیان بەخشندەیی نەکەن، تەنیا بەو نیەتە خراپە خودای گەورە مەحرومی کردن لە بەروبومی باخەکە وەک لە سوڕەتی (القلم)دا هاتووە.

١١. مەنعکردنی هەژارەکان لە ماڵ و سامان لە خەسڵەتی خراپترینی مرۆڤەکانە کە خودای گەورە لە هەمان سوڕەتدا باسی کردووە.

١٢. ئەوانەی کەلوپەل لە خەڵک مەنع دەکەن، دیسان لە بێدینترینی مرۆڤەکانن: ﴿ وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ ۝٧ ﴾ الماعون: ٧، واتا: وە یارمەتی خەڵک نادەن (واتا: هەموو چاکەیەک دەگرنەوە لە مەردووم).

١٣. مرۆڤی ناهاوسەنگ بەهۆی بەخشندەیی و خەسڵەتەکانی دیکە هاوسەنگ دەبێ و دەچێتە بەهەشت: ﴿ وَٱلَّذِينَ فِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ ۝٢٤ ﴾ المعارج: ٢٤، واتا: وە ئەوانەی کە بەشێکی دیاریکراو لە داراییاندا هەیە. ئەوان ئەهلی بەهەشت و هاوسەنگن.

١٤. بەخشین لە سەرەکیترین خەسڵەتی بڕوادارانە کە خودای گەرە لە سەرەتای سوڕەتی (البقرة) باسی کردوە: ﴿ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ۝٣ ﴾ البقرة: ٣، واتا: ئەوانەی باوەڕ بە غەیب دەهێنن و نوێژ دەکەن و لەو ڕزقانەی پێم داون ئەبەخشن.

١٥. زەکات و نوێژ لەیەک جیا نابنەوە، نوێژ پەیوەندی ڕاستەقینەی مرۆڤە بە خوداوە، زەکات بەندەدۆستی و خێر بۆ خەڵک ویستنە.

١٦. بەخشین لە ماڵ کەم ناکا: ﴿ قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥۚ وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَهُوَ يُخۡلِفُهُۥۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ۝٣٩ ﴾ سبأ: ٣٩، واتا: بڵێ: بێگومان پەروەردگارم ڕۆزی هەر کام لە بەندەکانی بیەوێ فرەوان یا کەمی دەکات بۆی، وە ئێوە هەر شتێك ببەخشن ئەوە خودا جێگەی پڕ دەکاتەوە، وە ئەو (خودا) چاکترینی ڕۆزیدەرانە.

**١٧.** خێری بەخشین سەدان و هەزاران قاتە: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾﴾ البقرة: ٢٦١، واتا: وێنەی (خێری) ئەوانەی کە ماڵی خۆیان بەخت دەکەن لە ڕێی خودادا وەک دەنکێک (تۆو) وایە (ڕوابێت) و حەوت گوڵی گرتبێت لە هەر گوڵێک سەد دانەی تێدا بێت، وە خودا لەمەش زیاتری دەکات بۆ هەر کەسێک کە خۆی بیەوێت، وە خودا خاوەن بەهرەی فرەوانی ئاگادارە.

**١٨.** ئەگەر بەدڵەوە نەبەخشی پیشەی دووڕووەکانە، چ جای ئەگەر هەر نەبەخشی: ﴿وَمَا مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَٰتُهُمْ إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾﴾ التوبة: ٥٤، واتا: وە هیچ شتێك ڕێگری نەکردووە لە گیرابوونی بەخشینەکانی ئەوانە، بێجگە لەوەی کە بێگومان ئەوانە بێباوەڕ بوون بە خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە نایەن بۆ نوێژ بەتەمەڵی نەبێت، وە (هیچێك) نابەخشن ئیللا پێیان ناخۆشە و ناچارن.

**١٩.** لە چەندین شوێنی قورئاندا هاتووە کە بەخشندەیی سیفەتی ئەهلی بەهەشتە: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمْ يُسْرِفُواْ وَلَمْ يَقْتُرُواْ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾﴾ الفرقان: ٦٧، واتا: وە کەسانێکن کاتێ ماڵ و سامان خەرج دەکەن (بۆ خۆیان و خێزانیان) نە زیادەڕەوی و نە ڕەزیلی و دەستنوقاوی (تێدا) ناکەن، (بەڵکو) مامنیۆەندییە لەو نێوانەدا.

**٢٠.** بەخشندەیی عەیببڕە و خاوەنەکەی هەردەم خۆشەویستە.

## فکرەی حەفتا و سێیەم: فەلسەفەی زەکات

١. لەسەرووی هەموو شتێکەوە جێبەجێکردنی دەیان ئایەت و سەدان فەرموودەیە کە فەرمانیان بە زەکاتدان کردووە.
٢. شوێنکەوتنی سەروەر و ڕابەرمانە ﷺ لە دانی زەکات، وە هەروها خولەفا و پیاوچاکان.
٣. جێبەجێکردنی پایەیەکی گرنگی ئەم دینەیە.
٤. لابرنی سیفەتی کافر و دووڕووەکانە کە لە قورئاندا ئەوانی پێ وەسف کراوە، واتا نەدانی زەکات.
٥. پاککرنەوەی دڵ و دەروونە لە بەخیلی.
٦. پاککرنەوەی ماڵە لە حەقی هەژاران.
٧. پاراستنی ماڵە لە بەڵا و ئافات.
٨. نزای پێغەمبەرمان ﷺ بۆ گیرا دەبێ.
٩. زەکات بریتییە لەو هاوکاری و تەعاونەی کە خودای گەورە فەرمانی پێکردوە.
١٠. زەکات تەکافولی ئیجتماعییە، واتە تێیدا کۆمەڵگە هەماهەنگ و هاوکار دەبن.
١١. ڕێژەی هەژاری لە کۆمەڵگە کەم دەکا.
١٢. خۆشەویستی و ڕێز لە کۆمەڵگەدا دروست دەکا.
١٣. جەریمە و تاوان کەم دەکا.
١٤. برایەتی ڕاستەقینە دروست دەکا.
١٥. حەسوودی لەبەین دەبا.
١٦. چینایەتی کەم دەکاتەوە.
١٧. شۆڕشی هەژاران دژی دەوڵەمەندەکان دەگۆڕێ بە هاوکاری و خۆشەویستی.
١٨. ڕێگای بەهەشتی پەروەردگارە.
١٩. ڕێگا لە ئاگری دۆزەخ دەگرێ.
٢٠. مردن ئاسان دەکا.
٢١. بەردەوام نزای هەژارانت بۆ دێ.

٢٢. سزای بەرزەخ و قیامەتت لەسەر لا دەبا.
٢٣. ئەو كەسەی خێر دەكا لەژێر سێبەری سەدەقەكەی حەشر دەكرێ و لە گەرمای دواڕۆژ ڕزگاری دەكا.
٢٤. دڵی مرۆڤی بەخشندە هەمیشە خۆشە.
٢٥. دەبیە نموونەیەكی جوان هەتا لەبەرچاوی ناحەزانیش دەزانن چەندە گەورەی.
٢٦. پێشكەوتنی وڵات و بوژانەوەی كەرتی تایبەت.
٢٧. دووركەوتنەوە لە قەرز و ڕیباخۆری كەم دەكا.
٢٨. هۆكاری قبووڵبوونی بەندایەتییەكانە.
٢٩. ئەركی سەرشانی حكومەت كەم دەكا.
٣٠. ڕێگا بۆ زەواج ئاسان دەكا، كە زۆر كەس بەم هۆیەوە زەواجی كردووە.
٣١. زۆر كەس لە مردن ڕزگاری دەبێ، كە نەخۆشی بۆ چارەسەر دەكرێ.
٣٢. كێشە دەروونییەكان كەم دەكەن، كە زۆر كەس بەهۆی هەژارییەوە تووشی كێشەی دەروونی بووە.
٣٣. خێزان لە شەڕ و ئاژاوە و لێكهەڵوەشان دەپارێزێ.
٣٤. وێنەیەكی جوانی ئیسلام پیشان دەدرێ.
٣٥. تەحقیقی مانای ئیمان دەكا.
٣٦. لە سەرەمەرگ و بەرزەخ و قیامەت پەشیمان نابینەوە.
٣٧. زەكات ئەندازەیەك نییە مرۆڤ پێی ئیزعاج بێ، بەڵكو لە قەدەر توانا و بە ئەندازەی دیاریكراوە.
٣٨. لە ڕێی زەكاتەوە پابەندی بە ئیسلام زیاد دەكا بۆ ئەو كەسەی چاكەی لەگەڵ دەكەی.
٣٩. میدیا چاك و بەسوودەكان بەردەوامییان دەبێ و زیاد دەكەن.
٤٠. حیزب و ڕێكخراوە بەسوودەكان بۆ كۆمەڵگە بەردەوام دەبن و زیاد دەكەن.
٤١. خەڵك لە حیكمەت و بەرەكەت و ئابوری ئیسلامی زیاتر تێ دەگا.
٤٢. تەحقیقی دادگەری دەكا لە كۆمەڵگەدا.
٤٣. موسوڵمانان دەپارێزێ لە هەڵگەڕانەوە و خۆفرۆشی و ویژدانفرۆشی.
٤٤. دەرفەت بۆ ڕێكخراوە تەبشیری و بێدینەكان كەم دەكاتەوە.
٤٥. هۆكاری گیرابوونی نزا و پاڕانەوەكانە.

## فکرەی حەفتا و چوارەم: زەکات لە چی بدەین؟

١. زێڕ و زیو و پارە.
٢. کەلوپەلی بازرگانی.
٣. ئاژەڵ: لە چوار جۆرەکە.
٤. کشتوکاڵ: دانەوێڵە و میوە.
٥. دوو بۆچوونی جیاواز هەیە دەربارەی زەکاتدان لە میوە و دانەوێڵە:
یەکەم: بۆچوونی مالیکی و شافیعی وحەنبەلی، کە مەرجی تایبەتییان هەیە بۆ داهاتی کشتوکاڵی، ئەوانە پێیان وایە دەبێ.
دووەم: ئیبن عومەر و کۆمەڵێک لە زانایانی سەلەف: زەکات تەنیا لە چوار شتدایە لە داهاتی کشتوکاڵی، ئەوانیش بریتین لە: گەنم و جۆ و خورما و مێوژ.
٦. مالیکی و شافیعی: زەکات لەوەدا هەیە کە قوتە و هەڵدەگیرێ.
٧. حەنبەلییەکان: زەکات لەوەدا هەیە کە وشک دەکرێتەوە و دەمێنێتەوە و دەپێورێ.
٨. حەنەفییەکان و زاهیرییەکان: ئەوەی کە زەوی دەیڕوێنێ و سەرچاوەی بژێوی ژیانە.

بەڕاستی بۆچوونی حەنەفییەکان و زاهیرییەکان زۆر فرەوانە و بۆ سەردەمی ئێستا گونجاوە، چونکە زۆر شت هەیە دەبێتە هۆی دەوڵەمەندی و داهاتی باش بۆ خەڵک کە نە گەنمە و نە جۆیە و نە خورمایە و نە مێوژە و نە برنج، لەوانەیە میوەکان یان سەوزەکان یان گیادەرمانییەکان بن کە قیمەتی باش دەکەن و دەبنە هۆی دەوڵەمەندبوون. وە لەبەر عمومی ئەو ئایەتانەی کە باسی بەخشین دەکەن لە هەموو ئەو شتانەی کە زەوی وەدەری دەنێ و مرۆڤەکان لە ڕێی کەسابەتەوە دەری دەخەن:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ٢٦٧ ﴾ البقرة: ٢٦٧، واتا: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە بەخت بکەن لە پاکترینی ئەوەی پەیداتان کردووە، وە لەوەی کە بۆمان دەرهێناون (ڕواندوون) لە

زەوی، وە نەکەن لەوەی ببەخشن کە خراپە لە کاتێکدا کە خۆتان ئەو شتە خراپە وەرناگرن (ئەگەر بتان درێتێ) مەگەر چاوی لێ بپۆشن، وە چاک بزانن کە خودا بێنیازێکی شایستەی ستاییشە.

گومان لەوەدا نییە سێو، پرتەقاڵ، تەماتە، خەیار، ... هتد، هەموو ئەو شتانەن کە زەوی دەیڕوێنێ.

٩. ئەم بابەتە زۆر کورتە و بەئامانج نووسراوە، دەمەوێ بڵێم مامۆستایانی ئایینی ئاوڕ بەلای ئەوەدا بدەنەوە، هەر نەڵێن: زەکات تەنیا لە دانەوێڵە و خورما و مێوژە، بەڵکو هەر شتێک مایەی دەوڵەمەند بوون بێ پێی دەوترێ: ماڵ، خودای گەورەش دەفەرمووێ: ﴿ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ١٠٣ ﴾ التوبة: ١٠٣، واتا: وەر بگرە لە ماڵ و دارایییان سەدەقەیەك بەهۆیەوە پاکیان دەکەیتەوە (لە گوناە) و (دڵیان) پوخت و خاوێن دەکەیت بەو ماڵبەخشینە و دوعا و نزای خێریان بۆ بکە، بەڕاستی دوعای تۆ ئارامی و دڵخۆشییە بۆ ئەوان، وە خودا بیسەری زانایە.

## فکرەی حەفتا و پێنجەم: زەکات بدەین بە کێ؟

خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠﴾ التوبة: ٦٠، واتا: بەڕاستی خێرەکان تەنها بۆ بێنەوایان و هەژاران و کرێکارانێکە کە بەسەریەوەن (کۆی دەکەنەوە) وە ئەوانەی دڵیان دادەهێنرێ (بۆ خۆشویستنی ئیسلام) وە بۆ ئازادکردنی بەندە و کۆیلەکان و بۆ قەرزداران و لە ڕێی (بەهێزکردنی ئایینی) خودادا و بۆ ڕێبواران، ئەمە پێویستکراوە لە لایەن خوداوە، وە خودا زانای کاردروستە.

خودای گەورە هەشت سنفی دیاری کردوون بۆ پێدانی زەکات، بەشێکیان بە لامی تملیک (ال)، واتا ئەوانە خاوەنداری ماڵەکە دەکەن، ئەوانەش:

- فەقیر.
- مسکین.
- کۆکەرەوەی زەکات.
- دڵڕاگیراوەکان.

بەشێکی دیکەیان بە (في) باسیان کراوە کە (في) بۆ ظەرفە، ظەرفیش بۆ عموم و گشتگیرییە، واتا ماناکەی لە ناوهێنراوەکان فرەوانترە، واتا هەرچی لە واتای باسکراوەکاندا بێ دەیگرێتەوە، ئەوانەش:

- کۆیلە و کەنیزەک.
- قەرزدار.
- لەڕێی خودا.
- ڕێبوار.

کەواتا:

- ئەگەر کەسێکمان بینی لە کونجی زیندان بوو بەناحەق، وە بە پارە بەردەبوو ئەوە کۆیلە دەیگرێتەوە.

- ئەگەر میللەتێک ژێردەستە بوو هەر مانای کۆیلەیە.
- ئەگەر کەسێک مارەکرابوو و خۆی پێ ڕزگار نەدەبوو هەر مانای کۆیلەیە.
- ئەگەر کەسێک ئەسیری جێگە بوو و نەخۆش بوو هەر مانای کۆیلە دەیگرێتەوە.
- کەسێک ئاوارە و هەژار بوو بەپێی (قیاس الاولی) باشتر لە ڕێبوارێکی کاتی دەیگرێتەوە.
- کەسێک دین بڵاو دەکاتەوە، یان کەناڵێک، یان مەدرەسەیەک، یان کتێبێک، یان پێویستییەکی دەعوە و دینداری بێ، هەمووی (في سبيل الله) دەیگرێتەوە.

ئاگادار بین لەنێو ئەو کۆمەڵانە ناوی هەتیو نەهاتووە، چونکە لە کاتی خۆی لە (بيت المال) ژیانیان دابین دەکرا، ئێستا لە خەڵکی دیکە پیویستترن بۆ زەکات ئەگەر داهاتیان نەبوو، چونکە واتایەکە گرنگە نەوەک ناوەکە.

زەکات وردیاتی زۆری تێدایە، بەڵام ویستم لە هەندێک خاڵی گرنگ و فەرامۆشکراو ئاگادار بین.

## فکرەی حەفتا و شەشەم: چەند بابەتێکی گرنگی زەکات

١. داهاتی کارگە و ڤێلا و هاووێنەکانیان، هەیە دەڵێ: زەکاتی تێدا نییە لەبەر ئەوەی لە دەقدا نەهاتووە، هەیە دەڵێ: زەکاتی تێدایە، چونکە:
یەکەم: ماڵە و (خذ من أموالهم) دەیگرێتەوە.
دووەم: ماڵێکە نما و زیاد دەکا، کە ئەمە عیللەتی زەکاتە.
سێیەم: داهاتێکی زۆری تێدا دەست دەخرێ.
چوارەم: خاوەنەکەی پێی دەوڵەمەند بووە، زەکات لە دەوڵەمەندان وەردەگیرێ: (تؤخذ من أغنيائهم).
٢. بەڵام چۆن زەکات بدەن؟
ئایا بەس لە داهاتەکەی بدەن، وەک هەندێک دەڵێن؟ ئەمەیان کێشە دروست دەکا، چونکە دەوڵەمەندەکان بەردەوام ڤێلا و مەکائین دەکڕن و داهاتەکەیان سەرف دەکەن، دەبێ ئەوانە حیسابی داهاتی خۆیان بکەن، با بڵێین دەولەمەندێک ساڵێک دە دەفتەری پەیداکرد، بەڵام دوو دەفتەری مەسرەفە، با زەکات لە هەشت دەفتەرەکە بدات، با بە شتی دیکەشی دابێ و پارەکەی نەمابێ.
٣. زەکاتی قەرز:
سێ جۆر قەرزمان هەیە:
یەکەم: قەرزێک کە لەسەر کەسێکی منکرە، واتا ئینکاری قەرزەکە دەکا، ئەم جۆرەیان دەبێ چاوەڕوان بکا تا خاوەنەکەی قەرزەکە دەسەلمێنێ، دواتر کە گێڕایەوە زەکاتی ساڵێکی لێ بدات.
دووەم: ئەو کەسەی کە معسرە، واتا تەنگدەستە و نیەتی بتداتەوە، وا هەیە چەند ساڵی پێ دەچێ، ئەو کەسەش کە دوای چەند ساڵ هێنایەوە زەکاتی ساڵێک کافییە، چونکە ئەو لەو پارە مستفید نەبووە.
سێیەم: ئەو کەسەی موسرە، واتا هەیەتی بتداتەوە، با ئەوەیان هەموو ساڵێ زەکاتی لێ بدات.
٤. زەکاتی خشڵ و زێڕ و زیوی ئافرەت:

هەیە دەڵێ: دەبێ زەكاتی لێ بدرێ، چونكە ماڵە و خاوەنەكەی پێی دەوڵەمەند بووە، وە هەیە لە زانایان كە دەتوانین بڵێین: زۆرینەن، پێیان وایە زەكات لە خشڵی ئافرەت واجب نییە.

وا دەردەكەوێ بۆچوونی ئەوانە ڕاست بێ، چونكە عیللەتی زەكات زیادكردنە، كە ئەو خشڵ و مارەییە كە زێڕە زیاد ناكات، هەر وەک كەسێک سەیارەی یان خانوەكەی بایی دە دەفتەریش بێ زەكاتی لێ نادا، ئافرەتیش بۆ خۆشی بەكاری دێنێ و زیاد ناكا، كەسێكیش بیدا ئیحتیات بكا ئاساییە، وە دەشتوانێ ساڵانە خێرێكی تێدا بكا.

٥. ئایا زەكات لە هەموو كەلوپەل و داهاتەكە دەدرێ یان لە سافسیەكەی، واتا لەوەی كە باقی مایەوە؟

دیارە دیسان دوو بۆچوون هەیە، بەڵام ئەوانەی كە داهاتیان كەمە و مەسرەفیان زۆرە دەتوانن لە باقییەكە بیدەن دوای دەركردنی مەسرەفەكە، وەک ئەوەی كە گەنم دەكا، بەڵام مەسرەفی زۆرە و داهاتی نییە.

٦. ئەوانەی دوكانیان داناوە، بەڵام بەشێكی زۆر لە دوكانەكەیان قەرزە، بۆ نموونە كەسێک دوكانەكەی بایی دوو دەفتەری تێدایە، بەڵام بایی یەک دەفتەر هی خۆیەتی، ئەو كەسە دەتوانێ زەكات لە هەمووی بدا، وە دەشتوانێ زەكات بەس لەوە بدا كە هی خۆیەتی.

# فکرەی حەفتا و حەوتەم: پێشخستن و دواخستنی زەکات

زەکات کە پێویست بوو دواخستنی دروست نییە، مەگەر زەکاتەکە ئامادە نەبێ یان دەستی بەسەردا گیرابێ یان دەستی پێڕا نەگات یان کەسی دەست نەکەوێ بیداتی، بەڵام پێشخستنی دروستە، بۆ نموونە کەسێک لە مانگی شەوال زەکاتی لەسەر پێویست دەبێ دەیخاتە ڕەمەزان دروستە، وە دەبێ ئاگادار بین زەکات بەپێی مانگی عەرەبییە، واتا نابێ بڵێی: من زەکاتەکەم ١/١ واجب بووە، هەر یەکی هەمان بەروار دەیدەم هەموو ساڵێ.

## فکرەی حەفتا و هەشتەم: زەکاتی باوک و دایک و کوڕ و کچ بۆ یەکدی

١. خودای پەروەردگار لە بەینی مرۆڤەکان خزمایەتی و نزیکی داناوە، بەڵام ئەو خزمایەتییە دەرەجاتی هەیە و ڕیزبەندی هەیە.
٢. بە غەیری دایک و باوک و خێزان و کچ و کوڕ ئەگەر نەفەقەیان یەک نەبێ زەکاتیان بەیەک دەشێ.
٣. دەکرێ ژن زەکاتی بداتە مێردەکەی ئەگەر فەقیر بوو.
٤. زەکات بە دایک و باوک: تەماشا دەکەین کە کوڕەکە یان کچەکە دەوڵەمەند بوو دەتوانێ هاوکارییان بکا، نابێ و دروست نییە زەکاتیان بداتێ، چونکە واجبە بەخێویان کا، بەڵام ئەگەر نەی دەتوانی هاوکارییان بکا هەر بەشی خۆی دەکرد، وە باوک و دایکی ماڵ و نەفەقەیان جیا بوو، دروستە زەکاتیان بداتێ، بۆ باوک و دایکیش هەر وایە بەرانبەر کوڕ و کچ.
٥. ئەگەر کوڕی خۆشی بێ یان دایک و باوکی بێ دروستە بە ناوی قەرزدار یان کۆکەرەوەی زەکات یان بەندە بیان داتێ، ئەوەی لە ئێستادا کردەییە ئەوەیە دروستە نزیکترین خزمەکان بە ناوی قەرزدارەوە زەکات بدەن بەیەکتر هەتا پیاو بۆ خێزانەکەی.
٦. ئەگەر دەزگایەک یان حکومەت زەکاتی کۆ دەکردەوە دروستە زەکاتەکەی تۆ بداتە نزیکترین کەسەکان.
٧. ئایا (بیت المال) و سندوقی خەیری زەکاتی لەسەرە؟ ڕای دروست ئەوەیە کە زەکاتی لەسەر نییە.
٨. ئەگەر گەنم و جۆ و هاوشێوەکانی زەکاتیان لێ درا جارێکی دیکە زەکات لە هەمان ماڵ دەدرێ؟ نەخێر زەکاتی لێ نادرێ، مەگەر بخرێتە بواری بازرگانییەوە.

## فكرەی حەفتا و نۆیەم: ڕاكردن لە زەكات

١. زۆر كەس هەیە زەكاتی لەسەر واجبە، بەڵام لە زەكات ڕا دەكا، من كەسم بینیوە دەڵێ: ئیمامی شەوكانی و ئەلبانی دەڵێن: زەكات لە كەلوپەلی بازرگانی نییە.
٢. هەیە دەوڵەمەندە خاوەنی چەندین ڤێلا و كارگەیە، بە بیانوی ئەوەی كە دەڵێن زەكات لە داهاتە، ئەویش بەردەوام ڤێلا و كارگەی نوێ دەكڕێ و قەت پارەی نییە، ئەو كەسە نابێ چاو لەسەر داهاتی زیاد لە كڕین دا بگرێ، بەڵكو بە فیعلی لە ساڵێكدا چی دەست دەكەوێ لە هەموو داهاتەكە زەكاتەكە بدا، با پارەشی نەبێ یان دوكانێك یام مەكائینێكی پێ كڕیبێ.
٣. ئافرەتی وا هەیە مانگانە موچەیەكی باشی هەیە دەیكاتە زێڕ، ئەو نابێ بڵێ: زێڕ زەكاتی تێدا نییە، چونكە زێڕەكەی ئەو لەجیاتی پارە دایناوە.
٤. كەسی وا هەیە ئەگەر كاتی زەكاتی نزیك بۆوە دەچێ شتێك دەكڕێ بە نییەتی نەدانی زەكات یان كەمكردنەوەی زەكات.
٥. نابێ زەكات بدەی بە كەسێك بە نییەتی ئەوەی ئەویش زەكاتت بداتەوە.
٦. نابێ زەكات وەر بگری ئەگەر یەكێك لە سنفەكان نەبی.
٧. باش نییە زەكاتەكەت هەموو بدەی بە كەسێك لە كاتێكدا زۆر لەو هەژارتر دەناسی، ئەمە باش نییە.
٨. خۆمان دەزانین بە هەر جۆرێك خۆمان لە زەكات بدزینەوە زەكات لەسەرمان لاناچێ.
٩. دروستیشە زەكات بدەین بە ڕێكخراوێك یان شەخسێك بۆت تەوزیع بكا، بە مەرجێك لێی دڵنیا و ئەمین بی.

## فکرەی هەشتایەم: زەکاتی فیترِ و زەکاتی سەرفیترە

١. زەکاتی فیترِ یان سەدەقەی فیترِ لە ساڵی دووەمی کۆچیدا پێویست کراوە، هەر لە هەمان ساڵدا زەکاتی ماڵ و ڕۆژووش پێویست کرا.
٢. لە (فطر)ی ڕەمەزانەوە هاتووە، واتا بەهۆی تەواوبوونی مانگی ڕەمەزان پێویست دەبێ.
٣. ئامانج تێیدا:
- لەسەرووی هەموو شتێکەوە ڕەزامەندی پەروەردگارە.
- پاککردنەوەی ڕۆژووەوانە لەو ناتەواوییانەی کە لە کاتی بەڕۆژووندا تووشی دەبن.
- بەسەرکردنەوەی هەژارەکانە بەهۆی ئەم بەخشینە واجبە.
- بێئیحتیاجکردنی هەژارانە، بۆئەوەی لەم ڕۆژە خۆشەدا بەشداری خۆشی کەسانی دیکە بکەن.
- تەعاون و هاوکاری کۆمەڵگەیە.
- زیادبوونی خۆشەویستییە لە نێوان موسوڵمانان.
- گەورەترین خێر ئەوەیە دڵی کەسێک خۆش بکەی.

## فكرەی هەشتا و یەكەم: زەكاتی فیترِ

١. زەكاتی فیتر لەسەر كێ واجبە: « فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى الْعَبْدِ وَالْحُرِّ، وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى، وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ »[١]. كەواتا لەسەر هەر كەسێك فەرزە لە موسوڵمانان بچووك بن یان گەورە بن، ئازاد بن یان كۆیلە بن نێر بن یان مێ دەوڵەمەند یان هەژار، مەگەر ئەوەندە هەژار بێ كە بۆ خۆی پێویست بێ پێی بدرێ.

٢. ئەو كەسەی كە لە ماڵەوە نەفەقە دەدا دەبێ زەكاتەكە لەبری ئەوەكانی دیكە بدا، بۆ نموونە خێزان، هەرچەندە لای حەنەفیەكان و زاهیرییەكان دەبێ ژن بۆ خۆی بیدا مادام دارایی خۆی هەبێ، بەڵام زۆرینە كە سێ ئیمامەكانی دیكەن دەڵێن: لەسەر پیاو و منالی نابالغە.

٣. ئەگەر ژنێك منداڵی هەتیوی هەبوو وە دارایی هەبوو دەبێ زەكاتی فیترِیان بۆ بدا، وە ئەگەر نەیبوو دەبێ لە ماڵی ئەوان زەكاتی فیترِیان بۆ بدا، ئەگەر هاتوو مێردەكەی تەنگدەست بوو و ژنەكە هەیبوو دەتوانێ زەكاتی فیترِیان بۆ بدا، یان با پرس بە مێردەكەی بكا وەك لە مەزهەبی حەنبەلیدا هاتووە.

٤. دانی زەكاتی فیترِ ئەوەیە ئەو كەسە لە پێویستییە ئەساسییەكان زیاتری هەبێ، وە زیاد لە خۆی و ماڵ و منداڵی هەبێ بۆ جەژن، ئەمە وا دەكا بابەتی بەخشندەیی زۆر چرِ بێتەوە لە كۆمەڵگەدا.

٥. قەرزێك كە كاتی نەهاتووە ڕێگر نییە لەبەردەم زەكاتی فیترِ.

---

[١]- صحيح البخاري: ٧١٩.

## فکرەی هەشتا و دووەم: چی بدەین لە سەرفیترە؟

هەموو ساڵێک لە ڕەمەزاندا ناکۆکی و دەمەتەقێ لەسەر ئەوە دروست دەبێ کە ئایا دەکرێ سەرفیترە بە پارە بدرێ یان دەبێ تەنیا خواردەمەنی بێ؟

١. زۆربەی زانایان لە کۆندا پێیان وایە دەبێ تەنیا خواردن بێ، پارە وەبری ناکەوێ.

٢. بەشێکیش لە زانایانی کۆن و زۆربەی زانایانی سەردەم پێیان ئاساییە کە پارەش بدرێ.

٣. ئەگەر تەماشای ئامانجەکانی شەریعەت و حاڵی فەقیر بکەین و بزانین لەمڕۆدا کامەیان لە قازانجی فەقیردایە، ئەوە بۆمان دەردەکەوێ کە دەبێ و دروستە.

٤. بۆیە لەجیاتی موناقەشە خەڵک بۆ خۆی ئازاد بکرێ ئایا چۆن زەکاتی خۆی دەر دەکا، یان چاوەڕوانی فەتوای گشتی بکرێ باشترە، بەدڵنیاییی هەر دووکیان دروستە و بەڵگە بۆ هەر دوو لا هەیە، لەمرڕۆدا پارە زۆر جێگە دەگرێ و هەر دووک ئامانجەکە دەپێکێ، هەم ئامانجی شەریعەت، هەم ئامانجی جێبەجێکردنی پێویستی هەژاران.

## فكرەی هەشتا و سێیەم: کەی زەکاتی فیترڕ بدرێ؟

١. زانایان یەک دەنگن کە بە تەواوبوونی ڕۆژووی ڕەمەزان زەکاتی فیترڕ واجب دەبێ، بەڵام ئەگەر پێشتر بدرێ ئاساییە.
٢. ئەم سەرفیترە جەژنانەیە کە دەدرێ بە هەژارەکان، بۆیە دەبێ وا بکەین لە جەژندا پێویستییان بەملا و لا نەبێ.
٣. بۆئەوەی دیاردەی سواڵکردن و ماڵانگەڕی نەمێنێ.
٤. نابێ لە ڕۆژی جەژن دواتر بکەوێ.
٥. دەکرێ چەند کەسێک زەکاتی فیترەکە کۆ بکەنەوە و بیدەن بە کەسێک بۆ ئەوەی کەلێنێکی باش بگرێ بۆ هەژاران.
٦. با ئەگەر زەکاتمان دا هەوڵ بدەین دڵی بەرانبەر نەشکێنین.

## فکرەی هەشتا و چوارەم: پایە و پێگەی شەوی قەدر

١. ئەم شەوە هەڵبژێردراوی پەروەردگارە، هەر شتیکیش خودای گەورە هەڵی بژێری بێحیکمەت نییە: ﴿وَرَبُّكَ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخۡتَارُۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٦٨﴾ القصص: ٦٨، واتا: وە پەروەردگارت (ئەی موحەممەد ﷺ) ئەوەی بیەوێ دروستی دەکات و هەڵی دەبژێرێ، (خەڵکی) هەڵبژاردنیان بۆ نییە (لە کاری خودادا)، خودا پاك و بێگەرد و بەرز و بڵندە لەوەی دەیکەنە هاوبەشی.

٢. سوڕەتێک لە قورئان بەم ناوە ناونراوە.

٣. خودای گەورە بە شێوازی گەورەکردن (أسلوب التفخيم) پرسیاری کردووە، واتاکەی ئەوەیە کە لە توانای مرۆڤدا نییە واتاکەی بزانێ، بۆیە خودای گەورە بۆت ڕوون دەکاتەوە.

٤. ئەم شەوە کەوتۆتە ڕەمەزانەوە کە مەوسیم و کاتێکی تایبەتە.

٥. تێیدا فریشتەکان دادەبەزن و گەورەی فریشتەکانیش دادەبەزێ کە جوبرائیلە سەلامی خودایان لێ بێ: ﴿تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ٤﴾ القدر: ٤، واتا: لەو شەوەدا فریشتە و جوبرائیلیش لەنێویاندا دێنە خوارەوە بە فەرمانی پەروەردگاریان لە هەموو کاروبارێکدا.

٦. ئەم شەوە و بەندایەتی لەم شەوەدا چاکترە لە هەزار مانگ: ﴿لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ٣﴾ القدر: ٣، واتا: شەوی بەفەڕ و ڕێز چاکترە لە هەزار مانگ.

٧. ئەم شەوە تا بەیانی سەلام و بەرەکەتە.

٨. ئەم شەوە ماوەکەی تەنیا چەند دەقە و سەعات و دوو سەعات نییە، بەڵکو لە ڕۆژئاوابوون تا بەرەبەیانە: ﴿سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ٥﴾ القدر: ٥، واتا: ئەو شەوە (کاتی) هێمنی و ئاشتی دەبێ تا هەڵاتنی شەبەق.

٩. ئەم شەوە موبارەكە: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَـٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَـٰرَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ۝٣ ﴾ الدخان: ٣، واتا: بەڕاستی ئێمە ئەم قورئانەمان لە شەوێكی پیرۆزدا ناردۆتە خوارەوە، بێگومان ئێمە ترسێنەرین.

١٠. لەم شەوە پیرۆزەدا ئەرزاق و ئاجالی ساڵانە دیاری دەكرێ: ﴿ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ۝٤ ﴾ الدخان: ٤، واتا: لەو (شەوە پیرۆزە)دا هەموو كاروبارێكی بەجێ لە یەك جیادەكرێتەوە.

١١. فەرمانمان پێكراوە بەدوایدا بگەڕێین: « أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: " تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْوِتْرِ مِنَ الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ " ».[١]

١٢. شەوی دوعایە: « عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ عَلِمْتُ أَيُّ لَيْلَةٍ لَيْلَةُ الْقَدْرِ، مَا أَقُولُ فِيهَا؟ قَالَ: " قُولِي: اللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ؛ فَاعْفُ عَنِّي " ».[٢]

١٣. كەسێك لەو شەوە مەحروم بێ بەڕاستی مەحرومە.

١٤. كەسێك ڕێزی بگرێ نیشانەی تەقوایە: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ۝٣٢ ﴾ الحج: ٣٢، واتا: ئەمە (كە باسكرا نموونەی هاوبەشدانان بوو بۆ خودا) وە هەر كەس دروشمەكانی (ئایینی) خودا بەگەورە ڕا بگرێ، ئەوە بەڕاستی ئەو كارە لە لەخوداترسی دڵەكانیانەوەیە (تەقواكارن).

١٥. شەیتانەكان لە هەر كات زیاتر هەراسان دەبن بەهۆی دابەزینی بێشوماری فریشتەكان.

یا رب ئەم شەوە و قبووڵی بەندایەتی ئەو شەوەمان پێ عەتا بفەرموو.

---

[١]- صحيح البخاري: ٩٥١.
[٢]- سنن الترذي: ٣٥١٣.

# فکرەی هەشتا و پێنجەم: شەوی قەدر کەیە؟

١. شەوی قەدر لە مانگی ڕەمەزاندایە.
٢. وردتر لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندایە.
٣. وردتر لە تاکەکاندایە.
٤. زۆرینەش دەڵێن: شەوی بیست و حەوتە.
٥. بۆچی دیار نییە بەڕوونی؟

❖ بۆ ئەوەیە مرۆڤ تەواو هەوڵی خۆی بدا، وە ئەو کەسانەشی کە ڕاست و جددین لەوەکانی دیکە جیا دەبنەوە.

❖ نهێنی گەورە هەیە لەم شتانەدا، ئەگەر بهاتبا و کاتی ئەجەلمان دیاربا، ئەوە بە هەر دوو دیودا زیانمان دەکرد، بۆ ئەوانەی کە تەمەنیان کەم ماوە تووشی نەخۆشی دەروونی دەبوون و ئیسراحەتیان نەدەکرد، ئەوانەش کە زۆریان ماوە تەواو شوڵیان لێ هەڵدەکێشا.

❖ قیامەتیش بە هەمان شێوە، زۆر شتی دیکەش بە هەمان شێوە، وەك: نەخۆشی، دەوڵەمەندی ... هتد.

❖ کەواتا با ئێمە لە هەر دە شەوەکانیش هەوڵی خۆمان بدەین، بەوە سوننەتی ئازیزمان ﷺ جێبەجێ دەکەین.

❖ چونکە لەم بابەتە فەرموودەکان جیاوازییان هەیە ئاخۆ کام شەوەیە، بەڵام ڕاستییەکەی هەموویان ڕاستن، چونکە ئەم شەوە گۆڕانکاری بەسەردا دێ.

❖ ئایا کەسێک بۆی هەیە بزانێ کەیە؟ بەڵێ بەپێی فەرموودەکەی دایکمان عائیشە رضي الله عنها دەکرێ بزانرێ، چونکە فەرمووی: ئەگەر زانیم چ شەوێکە، چ بڵێین؟

## فکرەی هەشتا و شەشەم: لە شەوانی قەدردا چی بکەین؟

١. ڕەمەزان خەرمانێکی گەورەیە بۆ کۆکردنەوەی چاکە و خێر و توێشوی قیامەت، بۆیە ئەوەی پەرۆشی دواڕۆژی خۆی و دواڕۆژی ئەم میللەتەی بێ نابێ بەسەر ئەم هەلەدا بازدا.
٢. گرنگیدان بە جەماعەت و چوون بۆ مزگەوت، بەتایبەت بۆ پیاوان و بەپێی توانا بۆ ئافرەتانیش.
٣. گرنگیدان بە قورئان، چ خوێندن، فێرکردن، فێربوون، وردبوونەوە ... هتد.
٤. گرنگیدان بە شەونوێژ بەپلەی یەکەم تەراویحەکان.
٥. گرنگیدان بە شەوی قەدر لە کاتی خۆیدا.
٦. گرنگیدان بەپاکوخاوێنی مزگەوت.
٧. گرنگیدان بە زیکر و دوعا.
٨. گرنگیدان بە منداڵان.
٩. گرنگیدان بە گەنجان و ئافرەتان.
١٠. گرنگیدان بە نوێژی جەماعەت.
١١. گرنگیدان بە خێر و خێرات.
١٢. گرنگیدان بە بانگەوازی.
١٣. گرنگیدان بە دەرس خوێندن بەپێی مەجال.
١٤. خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی کە باڵانسی ئیمانت بەرز دەکەنەوە.
١٥. بانگکردنی هاوڕێکانت بۆ مزگەوت.
١٦. کەمتر بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان.
١٧. نوێکردنەوەی تەوبە.
١٨. گۆڕانکاری بەسەر تەواوی ژیانماندا بێنین.
١٩. هەر کارێکی خێر لە دەستمان بێ، بەڵام ئەولەوییەت بۆ قورئان و نوێژ و زیکر بێ.

# فکرەی هەشتا و حەوتەم: باسی ئیعتیکاف

١. ئیعتیکاف بەندایەتییەکی قەدیمە، خودای گەورە لەگەڵ پێغەمبەر ئیبراهیم و ئیسماعیلدا عليهما السلام باسی کردووە: ﴿ وَإِذۡ جَعَلۡنَا ٱلۡبَيۡتَ مَثَابَةٗ لِّلنَّاسِ وَأَمۡنٗا وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ وَعَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ١٢٥ ﴾ البقرة: ١٢٥، واتا: بیر بکەنەوە کاتێک کە کەعبەمان گێڕا بە پەناگەی خەڵکی و جێی ئاسایش، (پێمان وتن) شوێنی ئیبراهیم بکەنە جێگەی نوێژ، وە سپاردمان بە ئیبراهیم و ئیسماعیل کە ماڵەکەم پاک بکەنەوە بۆ ئەوانەی کە بەدەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوە و ئەوانەی کە تیایدا دەمێننەوە هەروەها کڕنوشبەران و سوژدەبەران.

٢. ئیعتیکاف سوننەتی بەردەوامی پێغەمبەر ﷺ بووە.

٣. لەدوای پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانی و هاوەڵان لەسەری بەردەوام بوون.

٤. ئیعتیکاف مانەوەیە لە مزگەوت بە نیەتی خوداپەرستی، ئەگەر لە ڕەمەزاندا بێ باشترە.

٥. ئەگەر مزگەوتەکە جامع بێ و گەورەتر بێ باشترە.

٦. ئەگەر مزگەوتەکە جومعەی تێدا بکرێ باشترە.

٧. لە مەرجی ئیعتیکاف بەرۆژووبوون، نییە ئەگەر هەبێ باشترە.

٨. کاتی دیاریکراوی نییە، بەڵام ئەگەر زۆر بێ باشترە.

٩. ڕووحی ئیعتیکاف بریتییە لە: (قطع العلائق عن الخلائق لرب الخلائق).

١٠. ئیعتیکاف بە خەو بەڕێ نەکەین، واتا زۆر خەوتن.

١١. زۆر قسەکردن، زۆر خواردن، زۆر تێکەڵبوون، ئەمانە باش نین.

١٢. بەهۆی ئیعتیکاف فێری شەونوێژ دەبی.

١٣. فێری بەڕۆژووبوون دەبی.

١٤. بە کاری پێویست نەبێ نابێ بچیە دەر.

١٥. بە جیماعکردن و چوونەدەری بێهۆ هەڵدەوەشێتەوە و نابێ دەستبازی و پێشەکییەکانی جووتبوون لەگەڵ خیزانتدا بکەی.
١٦. ئیعتیکاف مزگەوتمان لا خۆشەویست دەکا و دڵمان پێیەوە پابەند دەبێ، کە خاوەنانی ئەم سیفەتە یەکێن لەو تاقمانەی کە لە قیامەتدا لە سایەی عەرشی پەروەردگاردان.
١٧. با ئیعیکاف کاتی بیرکردنەوە لە قەبر و قیامەت و تاوانەکانمان بێ.

# فكرەی هەشتا و هەشتەم: گەورەیی زیكر

١. خودای گەورە فەرمانی كردووە بەپاكی بگرین: ﴿ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ ﴾ الأحزاب: ٤٢.

٢. خودای گەورە پێمان دەفەرموێ ئەهلی زیكر و شوكر بین، نەوەک ئەهلی كوفر و سپڵە: ﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾ البقرة: ١٥٢.

٣. خودای گەورە دەفەرموێ زۆر زیكر بكەن: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ ﴾ الأحزاب: ٤١.

٤. ئەوانەی زیكر دەكەن لە پیاوان و ئافرەتان خودای گەورە بەهەشتیان بەنسیب دەكات و لێیان خۆش دەبێ: ﴿ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾ ﴾ الأحزاب: ٣٥.

٥. خودای گەورە فەرمانمان پێ دەكا بەیانی و ئێوارە زیكر بكەین: ﴿ وَاذْكُرْ رَبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ ﴿٤١﴾ ﴾ آل عمران: ٤١.

٦. ژیرەكان ئەوانەن كە هەر دەم زیكری خودا دەكەن ئەگەر بەپێوە بن، یان بەدانیشتنەوە، یان ڕاكشاو بن: ﴿ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ ﴾ آل عمران: ١٩١.

٧. خودای گەورە لەدوای گەورەترین بەندایەتی كە حەجكردنە پێمان دەفەرموێ دەبێ زیكر بكەین: ﴿ فَإِذَا قَضَيْتُمْ مَنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ﴾ البقرة: ٢٠٠.

٨. خودای گەورە پێمان دەفەرمووێ كە ماڵ و منداڵ هەر چەند خۆشەویستن، بەڵام نابێ لە زیكری خودا بێئاگامان بكا: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٩ ﴾ المنافقون: ٩.

٩. فەرمانمان پێكراوە بەملكەچی و بەترسەوە یادی خودا بكەین و بێئاگا نەبین: ﴿ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ٢٠٥ ﴾ الأعراف: ٢٠٥.

١٠. « قال رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لا يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الحَيِّ وَالمَيِّتِ " »[١]، پێغەمبەری خودا ﷺ ئەهلی زیكر و ئەوانەی كە زیكر ناكەن وێنا دەكا بە مردوو و زیندوو.

١١. « قال رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَلَا أُنَبِّئُكم بِخَيْرِ أعمالِكُم، وأَزْكاها عِندَ مَلِيكِكُم، وأَرفعِها في دَرَجاتِكُم، وخيرٌ لكم من إنْفاقِ الذَّهَبِ والوَرِقِ، وخيرٌ لكم من أن تَلْقَوا عَدُوَّكم، فتَضْرِبوا أعناقَهُم، ويَضْرِبوا أعْناقكُم؟! "، قالوا : بَلَى، قال: " ذِكْرُ اللهِ " ».[٢] پێغەمبەری خودا ﷺ پێمان دەفەرمووێ زیكر باشترە لە بەخشینی زێڕ و زیو، وە لەوەی لە گەردنی بێباوەڕانی ستەمكار بدەین، وە دەرەجەمان بەرز دەكاتەوە، گوناهمان ڕەش دەكاتەوە.

١٢. « قال رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " يقولُ اللَّهُ تَعالَى: أنا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بي، وأنا معهُ إذا ذَكَرَنِي، فإنْ ذَكَرَنِي في نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ في نَفْسِي، وإنْ ذَكَرَنِي في مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ في مَلَإٍ خَيْرٍ منهمْ، وإنْ تَقَرَّبَ إلَيَّ بشِبْرٍ تَقَرَّبْتُ إلَيْهِ ذِراعًا، وإنْ تقرَّبَ إلَيَّ ذِراعًا تَقَرَّبْتُ إلَيْهِ باعًا، وإنْ أتانِي يَمْشِي أتَيْتُهُ هَرْوَلَةً " ».[٣] لەم فەرموودە قودسییەدا خودای گەورە دەفەرمووێ: من بەپێی گومانی بەندەكەمم، ئەگەر لە دڵی خۆیدا یادم بكا، منیش لای خۆم باسی دەكەم، ئەگەر لەنێو خەڵكدا زیكر و باسم بكا، من لای كەسانێك لەوان چاكتر و گەورەتر

---

[١]- صحيح البخاري: ٦٤٠٧.
[٢]- سنن الترمذي: ٣٧٠٤.
[٣]- صحيح البخاري: ٧٤٠٥.

باسی دەکەم، ئەگەر بستێک بێ بۆ لام، من گەزێک دەچم بۆ لای، ئەگەر گەزێک بێ، باڵێک بۆ لای دەچم، ئەگەر بەپێ بێ بۆ لام، بەنەرمەلۆقە بۆ لای دەچم.

١٣. « قال رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " مَنْ قَعَدَ مَقْعَدًا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ فِيهِ كَانَتْ عَلَيْهِ مِنَ اللَّهِ تِرَةٌ، وَمَنْ اضْطَجَعَ مَضْجَعًا، لَا يَذْكُرُ اللَّهَ فِيهِ كَانَتْ عَلَيْهِ مِنَ اللَّهِ تِرَةٌ " ».[١] لە هەر شوێنێک بین جا کۆڕ و مەجلیس بێ یان پاڵدانەوە بێ ئەگەر زیکر نەکەین پەشیمانین.

١٤. « قال رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " ما من قوم يقومونَ من مجلسٍ لا يذكرونَ اللهَ فيهِ إلا قامُوا عن مثلِ جيفةِ حمارٍ، وكان لهم حسرةٌ " ».[٢] لەم ڕیوایەتەشدا هەر باسی پەشیمانی دەکرێ لە زیکر نەکردن.

١٥. « قال رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " ما جَلَس قومٌ مجلسًا لم يذكروا اللهَ فيه ولم يُصلُّوا على نبيِّهم إلَّا كان عليهم تِرةٌ فإن شاءَ عذَّبَهم وإن شاءَ غفَر لهم " ».[٣] لەم ڕیواتە باسی لێ نەدانی سەڵەواتیشی کردووە.

---

[١]- سنن أبي داود: ٤٨٥٦.
[٢]- سنن أبي داود: ٤٨٥٥.
[٣]- سنن الترمذي: ٣٣٨٠.

## فکرەی هەشتا و نۆیەم: سوودەکانی زیکر

ئیبن قەیم دەربارەی سوودەکانی زیکر ئەم خاڵە گرنگانە باس دەکا:
١. شەیتان لە دڵ دەردەکا.
٢. خودای گەورە ڕازی دەکا.
٣. خۆشی بۆ دڵ دێنێ.
٤. خەم و مەراق لا دەبا.
٥. دڵ و لاشە بەهێز دەکا.
٦. دڵ و دەم و چاو ڕووناک دەکا.
٧. ڕۆزی زیاد دەکا.
٨. هەیبەت و شیرینی بە ئینسان دەبەخشێ.
٩. خۆشەویستبوون بە مرۆڤ دەبەخشێ.
١٠. مرۆڤ فێری هەستکردن بە چاودێری خودا دەکا.
١١. لە خودا نزیکمان دەخاتەوە.
١٢. دەمان کاتە ئەهلی زیکر.
١٣. خودای گەورە باسمان دەکا.
١٤. دڵێکی زیندوومان پێ دەبەخشێ.
١٥. هەر وەک چۆن لاشە پێویستی بە خواردنە، زیکریش خۆراکی ڕووحە.
١٦. ڕزگارمان دەکا لە سزای خودا.
١٧. ئارامی دادەبەزێنێ بۆ سەر دڵ.
١٨. زوبان بەزیکرەوە سەرقاڵ دەبێ و ناپرژێتە سەر ئەو گوناهانە کە بە زوبان دەکرێ.
١٩. ئەو زیکر و تەسبیحاتانەی کە دەیکەین لەدەورەی عەرش وەک مێشەهەنگ ویزە ویز و دەنگی دێ.
٢٠. ئەگەر مرۆڤ لە شێنەیی یادی خودا بکا، خودای گەورە لە تەنگانەدا فریای دەکەوێ.
٢١. کۆڕی زیکر کۆڕی فریشتانە.

٢٢. بە زیکر ڕەحمەت دادەبەزێ.
٢٣. فریشتە دەورەی ئەهلی زیکر دەدەن.
٢٤. لای خودای گەورە باسی دەکرێ.
٢٥. بێجگە لەو کەسەی کە زیکر دەکا هەتا هاونشینەکەشی بەختەوەر دەبێ.
٢٦. زیکر بە چاوی فرمێسکەوە مرۆڤ دەخاتە ژێر سێبەری عەرشی خودا.
٢٧. لە قیامەتدا ئەهلی زیکر پەشیمان نین.
٢٨. ئاسانترین بەندایەتییە.
٢٩. زۆرترین خێری هەیە.
٣٠. لە هەموو حاڵێکدا دەکرێ، بێجگە لە کاتی چوونە سەرئاو و جووتبوون.
٣١. هەر زیکرێک درەختێکە لە بەهەشت.
٣٢. ئەو کەسەی کە زیکر دەکا و سەرقاڵە دوعای پێ ناکرێ، زیاتر لە دوعاکردنی پێ دەبەخشرێ.
٣٣. نیشانەی خۆشەویستی بەندەیە بۆ خودا، چونکە مرۆڤ چی خۆش بوێ باسی ئەوە دەکا.
٣٤. ئەو پاداشتەی بۆ زیکر دانراوە بۆ هیچ کردەوەیەک دا نەنراوە.
٣٥. زیکر لە هەموو موناسەبەیەکدا هەیە.
٣٦. مرۆڤ کە لەسەر جێگەش بێ بەرزی دەکاتەوە بۆ پلە هەرە باڵاکان.
٣٧. زیکر نوورە لە قیامەت، لە دنیا، لەنێو گۆڕ.
٣٨. زیکر دڵ بەئاگا دێنێ لە بێئاگایی و خەوی بێهۆشی.
٣٩. زیکر درەختێکە دەیان میوە و مەعاریف وەدی دێنێ.
٤٠. زیکر وەک ئازادکردنی بەندەیە.
٤١. وەک بەخشینی ماڵە.
٤٢. سەنگەرە بەرانبەر شەیتان.
٤٣. سەری زیکر شوکرە، کەسێک شوکر نەکا زیکری نەکردووە.
٤٤. دڵ ڕەقبوونی هەیە، بە زیکر نەبێ نەرم نابێ.
٤٥. زیکر بنچینەی موالات و موعاداتە، واتە دۆستایەتی و دوژمنایەتی.
٤٦. زیکری خودا دەبێتە هۆی ئەوەی کە خودای گەورە سەڵەوەتمان لەسەر لێ بدا.
٤٧. نیعمەت وەدی نایێ و بەڵا دوور ناکەوێتەوە بە هیچ شتێک بە ئەندازەی زیکر.
٤٨. باخێکە لە باخەکانی بەهەشت.
٤٩. خودای گەورە شانازی بە ئەهلی زیکرەوە دەکا.

٥٠. ئەو کەسەی زیکر دەکا بە پێکەنینەوە لە دنیا دەردەچێ.
٥١. هەموو کردەوەیەکی باش دانراوە لە پێناوی زیکری خودا، نوێژ، ڕۆژوو، حەج، قوربانی، ... هتد.
٥٢. لە هەر عیبادەتێکدا زیکری زیاتر تێدا بێ زیاتر لای خودا قبووڵ و خۆشەویستە.
٥٣. زۆر زیکرکردن جێگرەوەیە بۆ زۆر چاکە.
٥٤. زیکر هێزێکی وا بە موسوڵمان ئەدا کە کاری وا دەکا هەرگیز بە کەسێکی ئاسایی ناکرێ، ئیمە ئیبن تەیمیەمان دەبینی لە ماوەیەکی کەمدا نوسینێکی یەکجار زۆری دەکرد کە بە کەسێکی ئاسایی ناکرێ.
٥٥. زیکری خودا باشترین هاوکارییە بۆ گوێڕایەڵی پەروەردگار.
٥٦. زیکری خودا کارە زەحمەتەکان ئاسان دەکا، مەگەر پێغەمبەر یونس و ئیبراهیم ﷺ بە زیکر ڕزگاریان نەبوو؟!
٥٧. بە زیکرکردن بەدڵنیایی دەخەوی.
٥٨. هەرگیز تووشی نەخۆشی دەروونی نابی.
٥٩. فێری خۆڕاگری دەبین.
٦٠. لە نەخۆشی چاک دەبینەوە.
٦١. لە خراپە دەپارێزرێین.
٦٢. لە قیامەتدا ئەوانەی کە پێشبڕکێ دەبەنەوە ئەهلی زیکرن، وەک لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە.
٦٣. دەرگای خوداناسی دەکاتەوە.
٦٤. دەرگاکانی حاڵ و پلەکانی بەندایەتی بە موسوڵمان دەبڕێ.
٦٥. زیکر ڕێگرە لەبەردەم چوونە نێو ئاگر.
٦٦. فریشتەکان داوای لێبوردن بۆ ئەهلی زیکر دەکەن.
٦٧. فریشتە هەیە کە زیکر دەکەی یان قورئان دەخوێنی، هەموو ئەو شتانەت بۆ دەخاتە نێو هەناوی خۆی و دەم دەخاتە سەردەمت و بۆت خەزن دەکا.
٦٨. زیکرکردن لە نیفاق دەمانپارێزێ، چونکە مونافیقەکان کەم یادی خودا دەکەن.
٦٩. ئەهلی زیکر لە قیامەتدا نووریان هەیە.
٧٠. سەرقاڵیت بە زیکر سەرقاڵیتە لە هەموو شتێکی پوچ و بێکەڵک.
٧١. شەیتان تەنیا دەرەقەتی ئەوانە نایەت کە ئەهلی زیکرن.

## فکرەی نەوەدەم: سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ و سوودەکانی

١. سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ فەرمانی خودایە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦﴾ الأحزاب: ٥٦، واتا: بەڕاستی خودا و فریشتەکانی سەڵاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئێوەش سەڵات و سەلامی زۆری لەسەر بدەن.

٢. وەفایە بەرانبەری ئەو کەسەی کە ئێمەی لە گومڕایی ڕزگارکردووە.

٣. ئیمان بە پێغەمبەر ﷺ بەشێکە لە ئیمانی ئێمە.

٤. ئەگەر ئیمانمان پێ نەبێ نابینە مسوڵمان.

٥. ڕێگای ئەو تاکە ڕێگای چوونە بەهەشتە.

٦. کەسێ بە گەورایەتی ئەو قایل نەبێ نابێتە مسوڵمان.

٧. لە هەموو بووندا کەس لەو گەورەتر نییە.

٨. دوژمنەکانی وەک دۆستەکانی شایەتی گەورەیی بۆ دەدەن.

٩. ئەو پێغەمبەرە ﷺ لەقیامەتیشدا گەورەترین کەسە.

١٠. لە مەخلوقاتدا گەورەتر لەو نییە.

١١. مایک هارت لە نێوان سەد پیاوە گەورەکانی مێژوو کە کاریگەری هەرە گەورەیان لەسەر مەساری مێژوو هەبووە، یەکەمیان محمدی کوڕی عەبدوڵڵای ﷺ داناوە، دووەم ئیسحاق نیوتن، سێیەم عیسی (علیه السلام)، شازدەیەم موسێ (علیه السلام).

١٢. سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ سوودی زۆری هەیە، بەشێک لەو سوودانە:

- فەرمانی خودامان جێبەجێکردووە.
- موافیقی خودا بووین لە سەڵەواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ.
- موافیقی فریشتەکانین لە سەڵەواتدان لەسەر سەروەرمان ﷺ.
- موافیقی هەموو بڕوادارانین لە جنۆکە و لە بەشەر کە سەڵەوات لەسەر ئەو ﷺ دەدەن.

- به یەک سەڵەوات دە چاکەمان بۆ دەنووسرێ.
- دە گوناهمان لێ ڕەش دەبێتەوە.
- دە پلە بەرز دەکرێینەوە.
- خودای گەورە خۆی دە سەڵەواتمان لەسەر لێ دەدا.
- پێغەمبەر ﷺ خۆی وەڵاممان دەداتەوە.
- له بەخیلی ڕزگارمان دەبێ، چونکە بەخیل ئەو کەسەیە ناوی ئەو بهێنرێ و سەڵەواتی لەسەر لێ نەدا، عليه أفضل الصلوات وأتم التسليمات.
- دوعاکانی گیرا دەبێ.
- شەفاعەتی ئەو دەیگرێتەوە.
- هەموو خەم و مەینەتییەکانی لەسەر لادەچێ و کێشەکانی بۆ حەل دەبێ.
- کەسێک سەدەقەی پێنەکرێ بۆی وەبری سەدەقە دەکەوێ.
- کۆڕ و مەجلیسەکان بە ناوی ئەو نابنە هۆی پەشیمانی لە دوارۆژ.
- هۆکاری چوونە بەهەشت و دوورکەوتنەوە لە ئاگرە.
- له خزمەتدا بوونی پێغەمبەر ﷺ.
- هۆکاری خەون بینینە بە پێغەمبەرمان ﷺ.
- هۆکارێکە بۆ پەڕینەوە لە پردی صیراط، کە تەشریفیان لەوبەر چاوەڕوانە.
- دابەزینی بەرەکەت لە ڕزق و ڕۆزی.
- دایم دڵخۆش و مونەووەر.
- هۆکاری هیدایەتی زیاتر.
- کەمترین وەڵامدانەوەی چاکەکانی ئەوە.
- کرانەوەی دەرگای مەعریفە.
- زیاتر شارەزابوون لە ژیان و ئاکار و ڕەفتارەکانی.
- هۆکاری نەمانی هەژاری.
- سەڵەواتدان لەسەر ئەو لە تایبەتمەندییەکانی ڕۆژی جومعەیە.
- زۆر لە عیبادەتەکان بێ سەڵەوات نابن.
- هۆکارە بۆ مزگێنیدان لە سەرەمەرگ.
- کۆڕ و مەجلیس لە بۆگەنی ڕزگاری دەبێ و گوناهی مەجلیس دەسڕێتەوە.
- مرۆڤ دەگاتە پلەی ئارامی دڵ و دەروون (إطمئنان).
- هۆکارە بۆ تەواوبوونی وتە و وتار.

## فکرەی نەوەد و یەکەم: لە چ کات و شوێن و حاڵێکدا سەڵەوات لەسەر سەروەرمان ﷺ بدەین

١. مرۆڤ واجبە لە ژیانیدا سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات، چونکە خودای گەورە فەرمانی پێکردووە، بەڵام چەند جار و چۆن وردەکاری زۆرە.
٢. لە تەحیاتی یەکەم و دووەمدا، لەسەر هی یەکەم ڕاجیایی هەیە، بەڵام لەسەر تەحیاتی کۆتایی ڕاجیایی نییە.
٣. لە کۆتایی قنوتدا.
٤. لە نوێژی جەنازەدا.
٥. لە وتاری جومعە و جەژنەکان و نوێژە بارانە و ڕۆژگیران و مانگگیران.
٦. لەدوای تەواوکردنی بانگ.
٧. لە کاتی دوعا، ئەگەر لە سەرەتا، نێوەڕاست، کۆتایی سەڵەوات بدرێ زۆر باشە.
٨. لە کاتی چوونە مزگەوت و هاتنەدەر.
٩. لەسەر سەفا و مەڕوە.
١٠. لە کاتی کۆبوونەوە و لێکجیابوونەوە.
١١. لە کاتی تەواو بوون لە تەلبیە، واتا: دوای (لبیک اللهم لبیک) لە حەج و عومرەدا.
١٢. لە کاتی دەستدان لە بەردە ڕەشەکە.
١٣. لە کاتێک لەسەر قەبری ﷺ ڕادەوەستی.
١٤. لە کاتێک دەچیە بازاڕ یان هەر کۆڕێک.
١٥. لەدوای هەستان لە خەو.
١٦. لەدوای تەواوکردنی خەتمی قورئان.
١٧. لە شەو و ڕۆژی هەینی.
١٨. لە کاتی بەڵا و گرفت.
١٩. لە کاتی نووسینی ناوی ﷺ.
٢٠. لە کاتی دەرس خوێندن و نووسینی کتێب و موحازەرە.
٢١. لە سەرەتای ڕۆژ و کۆتایی رۆژ.
٢٢. لە کاتی هەژاری و ترس.

٢٣. لە کاتی وتاری داخوازی.
٢٤. لە هەر شوێنێک خەڵک کۆبێتەوە بۆ زیکری خودا.
٢٥. لە کاتێک شتێکمان لەبیرچۆوە.
٢٦. لەدوای نوێژەکان.
٢٧. وە بەدڵێکی ئامادە سەڵەوات بدەین.
٢٨. وە خەڵکی بۆ هان بدەین.
٢٩. شانازی پێوە بکەین نەوەک شەرم.
٣٠. ئەگەر بکرێ دەستنوێژمان هەبێ باشە، دەنا بێ دەستنوێژیش دەبێ.
٣١. منداڵەکانمان فێری سەڵەوات بکەین.
٣٢. جار جار وتار و موحازەڕەی بۆ تایبەت بکەین.
٣٣. خوێندنەوەی ژیاننامەی ئەو بەشێکە لەو زیکر و خێرە سەڵەواتە.
٣٤. گرنگیدان بە یادکردنەوەی لە بۆنە و موناسەبەکاندا.
٣٥. هەموو کاتێک بقۆزینەوە بۆ ناساندنی.
٣٦. هاوکاری ئەو پرۆژانە بکەین کە بۆ ناساندنی ئەوە ﷺ.

## فكرەی نەوەد و دووەم: جۆرەكانی دوعا و مەرجەكانی

١. دوعای عبادة: ئەوەیە كە مرۆڤ لە یەكێك لە پەرستشەكاندا بێ، وەك: نوێژ، ڕۆژوو حەج، زیكر.
٢. دوعای مسألة: ئەوەیە كە بەزوبان داوا لە خودا بكەین.
٣. وە دوعا هەیە تەنیا بەدڵە و دوعا هەیە بەئاشكرا.
٤. دوعا هەیە بەو شتانەی كەواریدە و هاتووە لە قوڕئان و سوننەتدا.
٥. دوعا هەیە نەهاتووە لە سوننەتدا.
٦. دوعا هەیە بە چاكە.
٧. دوعا هەیە بە خراپە، كە ئەمەیان نابێ.
٨. دوعا هەیە بە بەئاگایی و دڵی بێدارەوە.
٩. دوعا هەیە بەغەفڵەت و بێئاگاییەوە.
١٠. دوعا هەیە گشتییە.
١١. دوعا هەیە تایبەتە.
١٢. دوعا بۆ خۆت هەیە.
١٣. دوعا بۆ غەیری خۆت هەیە.
١٤. دوعا هەیە بەس بۆ دنیایە.
١٥. دوعا هەیە بۆ دنیا و دوارۆژە.
١٦. دوعا كە بیكەی بە مەرجی خۆی گیرا دەبێ.
١٧. یان بەڵات لەسەر لا دەبا.
١٨. یان نیعمەتێكت بە نسیب دەكا.
١٩. یان بۆت دەبێتە زەخیرەی دوارۆژ.
٢٠. دوعا هەیە لە قوڕئاندا نابێ بیكەین، وەك: ﴿رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ ﴿٨٩﴾﴾ الأعراف: ٨٩، چونكە ئەم نزایە شوعەیب (علیه السلام)

کردوویەتی بۆ یەکلاکردنەوەی نێوان خۆی و گەلەکەی، ئێمە بۆمان نییە وا بلێین. یان وەک ئەو دوعایە: ﴿ رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ الدخان: ١٢.

٢١. دوعا لە خودا دەکرێ، وە دوعا لە غەیری خودا دەکرێ کە بەهیچ شێوەیەک دروست نییە.

٢٢. دوعا هەیە بە ناو و سیفەتەکانی خودا، دوعا هەیە بە وەسیلەی کردەوەکانی خۆتە، هەر دووکیان دروستن، بۆیە گرنگە بزانین چۆن دوعا دەکەین.

٢٣. مەرجەکانی گیرا بوونی دوعا:

- یەکلابوونەوەیە بۆ خودا.
- ئەوەیە موافیقی شەرع بێ.
- متمانەتەبوون بە خودا، واتا بە یەقینەوە دوعا بکە.
- نزاکردن بەدڵێکی ئامادەوە.

٢٤. رێگرەکانی گیرابوونی دوعا:

- حەرام خواردن و خواردنەوە و پۆشین.
- پەلەکردن لە وەڵامدانەوە و وازهێنان لە دوعا.
- جۆری دوعاکە بۆ قەتعی خزمایەتی بێ.
- وازهێنان لە واجبەکان.

## فکرەی نەوەد و سێیەم: ئادابەکانی دوعا

١. لەئادابەکانی دوعا ئەوەیە بە ستاییشی خودا دەست پێ دەکا.
٢. سەڵەواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ.
٣. لە کاتی خۆشی دوعا بکەین، بۆ ئەوەی لە کاتی ناخۆشی وەڵام بدرێینەوە.
٤. نزای خراپ لە خۆی ماڵ و منداڵی و خەڵک نەکا.
٥. دروستە دوعا لە ستەمکاران بکەی.
٦. هەتا بکرێ بەدەنگی نزمەوە بێ.
٧. بەوپەڕی ملکەچی و لەخوداترسانەوە دوعا بکا.
٨. ئیلحاح بکا لە دوعاکردن، وەک ئەو کەسەی ئیشی بە کەسێکە و وازی لێ ناهینێ تا دوعاکەی گیرا دەکا.
٩. تەوەسول بکا بە ناو سیفەتەکانی خودا، وە بەکردەوە باشەکانی خۆی.
١٠. داننان بە تاوانەکان لای خودا زۆر خۆشەویستە.
١١. خۆی نارەحەت نەکا بە هۆنینەوەی دوعاکان، چۆنی بۆ هات با ئاوا دوعا بکا.
١٢. دوعاکان یان هەندێکیان سێ جار سێ جار دووبارە بکاتەوە باشە.
١٣. ڕوو لە قیبلە کردن.
١٤. دەستنوێژ هەبوون.
١٥. دەست بەرز کردنەوە لە کاتی دوعا.
١٦. نیشاندانی ئەوپەری ئیحتیاجی بە پەروەردگار.
١٧. گریان و لاڵانەوە.
١٨. سەرەتا نزا بۆ خۆت، ئەوجار دایک و باوک و ماڵ و منداڵ، ئەوجار مامۆستا و قوتابی و دۆست و ئەحباب.
١٩. زیادەڕەوی نەکردن لە دوعا و نزای نابەجێ نەکا.
٢٠. وازهێنان لە ستەمکردن.
٢١. خێر و سەدەقە.
٢٢. تەنیا و بەس داوا لە خودا بکا.

٢٣. نزا بۆ ئیمانداران بکا بە مردوو و زیندوویانەوە.

## فكرەی نەوەد و چوارەم: كات و شوێنەكانی گیرابوونی دوعا

١. شەوی قەدر.
٢. كاتی ڕۆژوو شكاندن.
٣. كاتی سەحەر.
٤. نێو نوێژەكان، وەک تەحیات و سوجدە.
٥. لە نێوان بانگ و قامەت لە كاتی بانگ.
٦. لە كاتی بارینی باران.
٧. كاتێک لەگەڵ دوژمنانی بێباوەڕ دەكەویە جەنگەوە و بەرانبەر دەبی.
٨. سەعاتێک لە هەر شەوێكدا هەیە.
٩. لە ڕۆژی جومعەدا.
١٠. لەو كاتانەی دڵت پاكە.
١١. لە كاتی خواردنەوەی ئاوی زەمزەم.
١٢. نزای كردن بە نزای پێغەمبەران كە لە قورئاندا هاتووە.
١٣. ئەو دوعایانەی لە سوننەتدا هاتوون.
١٤. لە كاتی هەستان لەخەو لە شەودا.
١٥. لە كاتی موسیبەت.
١٦. لە كاتی نەخۆشی.
١٧. لە ڕۆژی عەرەفە.
١٨. لە كاتی طەواف.
١٩. لە صەفا و مەروە.
٢٠. لەنێو كەعبە و لە پەنای كەعبە و دەرگای كەعبە.
٢١. لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ.
٢٢. لە كاتی خوێندنی فاتیحە بەدڵ.
٢٣. كاتی هەستانەوە لە ڕكوع.
٢٤. لە كاتی قنوت.

٢٥. لەکاتی نوێژی جەنازە.
٢٦. لە کاتی تەحیات، بەتایبەت دوای سەڵەوات.
٢٧. لەدوای دەستنوێژ.
٢٨. لە ڕەمەزان بەگشتی، وە بەتایبەت ئەو کاتەی کە بەڕۆژووی.
٢٩. لە کۆڕی زیکر.
٣٠. لە دە ڕۆژی (ذي الحجة).
٣١. لەو کاتەی کەڵەباب دەخوێنێ.
٣٢. لە کاتی ڕەجمکردنی شەیتان.
٣٣. لە موزدەلیفە.

## فکرەی نەوەد و پێنجەم: چیرۆکی گیرابوونی دوعا

١. عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ لە خودا پاڕایەوە و وتی: ئەی پەروەردگارم شەهیدیم بەنسیب بکە لە شاری پێغەمبەرەکەت ﷺ، فعلەن لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ لە نوێژی بەیانی ئەبو لوئلوئی مەجوسی شەهیدی کرد.

٢. ئیمام عومەر ﵁ لەحەجدا پاڕایەوە و وتی: ئەی پەروەدگارم، تەمەنم هەڵکشاوە ئێسکەکانم لاواز بوون، ڕەعیەتەکەم زۆر بووە، ئەی پەروەردگار بمگێڕیەوە لای خۆت بەبێ ئەوەی تووشی فیتنە بم.

٣. سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﵁ خاڵی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا والی بوو، یەکێک زۆر بەبێئەدەبی و بەناڕاستی تاوانباری کرد، سەعد وتی: ئەی پەروەردگار ئەگەر ئەو کابرایە بەدرۆ و بەریا ئەو قسانە دەکا، چاوەکانی کوێر بکەی، تەمەنی درێژ بکەی، هەژاری بکەی، تووشی فیتنەی بکەی، هاوەڵەکان دەڵێن: ئەو کابرایەمان بینی چاوەکانی کوێر ببوون، ئەوەندە هەژار بوو سواڵی دەکرد، تەمەنی زۆر درێژ ببوو بەپیری و بەکوێری دەچوو ئێقەی بە کچان دەگرت.

٤. سوفیانی کوڕی عویەینە، دەڵێن: هەموو ساڵێ کە دەچوو بۆ حەج دوعای دەکرد: خودای گەورە کۆتا ساڵم نەبێ بۆ ئێرە، واتا بۆ حەجی ماڵەکەت، هەموو ساڵێ دەچوو بۆ حەج تا کۆتا ساڵ، دەڵێ: شەرمم کرد هیچی دیکە لە خودا بپاڕێمە و بێمەوە حەج، بۆیە سوفیان هەر لەو ساڵەدا وەفاتی کرد.

٥. ئافرەتێکی بەساڵاچوو وەزیرێک زۆر ستەمی لێکرد و ماف و زەوی و شتەکانی داگیرکرد، زۆر لێی پاڕایەوە و وتی: بۆمی بگێڕەوە، ئەویش گاڵتەی پێ دەکرد، ڕۆژێک بەگاڵتەوە پێی وت: بڕۆ لە خودا بپاڕێوە لە سێیەکی شەودا، زۆری پێ نەچوو وەزیرەکە لە دەسەڵات لادرا، هەموو ماڵەکەی لێسەندرا، لەنێو خەڵک دارکاری کرا، پیرەژنەکە چووە بن گوێی وتی: سوپاست دەکەم خۆت سێیەکی شەوت بۆ دانام تا دوعات لێ بکەم، بەڕاستی بینیم سێیەکی شەو زۆر کاریگەرە.

٦. دوکتۆرێک بە ناوی هاشم یان هیشام دەڵێ: لەبەر ئەو خزمەتانەی کە پێشکەشم کردبوو لە بواری شەلەل دەماغ لە شوێنێک بانگهێشت کرام بۆ ئەوەی کارەکانم

بنرخینرێن و پاداشت بکرێم، بە فڕۆکە بەڕێکەوتم، وەختیک ئاگاداریان کردینەوە کە فڕۆکەکە لە فڵان فڕۆکەخانە دەنیشێتەوە و ناتوانێ درێژە بە فڕینەکە بدات، منیش زۆر تینم بۆ هات، ناچار بووم سەیارەیەکی زۆر باش بگرم بەتایبەت بۆ ئەوەی فریای کۆبوونەوەکە بکەوم، ماوەیەک ڕۆیشتین، بەڵام باران هێندە بەتاو دەباری ڕێگای نەدەدا بڕۆین تا بەدرەنگ کەوتین بۆ کاتی عیشا، لە شوێنێک لە پەنای ئاواییەک گیرم خواردبوو، ناچار دابەزیم بۆ ئەوەی جێگەیەک پەیدا بکەم، بینیم خانوویەکی بچووک کە ڕووناکی تێدا پێکرابوو بەرەو ئەوێ چووم، لە دەرگام دا و ئیزنم خواست بچمە ژوور، ئافرەتێکی بەتەمەن وەڵامی دایەوە و وتی: وەرە ژوور، کە چووم کەسێکی بەتەمەن بوو، دوکتۆر دەڵێ: وەک دەستوری لادێ بەدڵێکی ئاوەدان ڕێزی گرتم و چا و قاوەی پێدام و گەرمم بۆوە، خۆشم سەرم سوڕمابوو من بۆ کەوتمە ئێرە، لە پاشان ئافرەتەکەم بینی چوو بۆ غورفەیەکی دیکە، هەستم کرد کەسێکی لێبێ، بینیم منداڵێکی دە دوازدە ساڵان لەسەر جێگە ڕاکشاوە و جوڵەی نییە، وتم: دایە گیان ئەمە چیەتی بۆ لێرە کەوتووە؟، وتی: کوڕەکەم ئەوەی ڕاستی بێ ئەمە نەوەمە، باوک و دایکی نەماون و من بە خێوی دەکەم، بەڵام تووشی شەلەل بووە، سبحان الله دەڵێ: ئە جۆرە بوو کە من تێیدا پسپۆڕم، سەرم سوڕما، وتم: دایە گیان ئەی بۆ چارەسەرت نەکردووە، وتی: ئەوەی ڕاستی بێ لە تواناما نییە، دەڵێن: دوکتۆر هیشامێک هەیە دەتوانێ چارەسەی بکا، بەڵام من ناتوانم و پارەشم نییە، بەدڵ لە خودا پاڕامەوە کە ئەو کارەم بۆ ئاسان بکا، بەڵام هەتا ئێستا دوعاکەم گیرا نەبووە، بەچاوی پڕ لە گریانەوە وتم: دایە گیان دوعاکەت گیرا بوو، هەر دووکمان زۆر گریایین لە خۆشییان، وتم: من دوکتۆر هیشامم و هەمووی لەسەر حیسابی خۆم چارە دەکەم بە پشتیوانی خودا، دوکتۆر دەڵێ: زانیبووم دوعا گیرا دەبێ، بەڵام نەمزانی خودای گەورە بۆ خاتری ئافرەتێکی بەساڵاچوو فڕۆکە پەک دەخا و هەور دێنێ بۆ ئاسمان و من دێنێ بۆ ئێرە.

# فکرەی نەوەد و شەشەم: لەتیفەیەکی جوان دەربارەی قورئان

١. قورئان دابەزی بۆ سەر محمدی کوڕی عبد الله، بوو بە محمد رسول الله ﷺ.
٢. دابەزی بۆ سەر ئوممەتی نەخوێندوار، بوو بە مامۆستای مرۆڤایەتی.
٣. دابەزی بۆ سەر میللەتی ژێردەستە، بوو بە فاتیح و ڕزگارکەری مرۆڤ.
٤. دابەزی لە حیجازێک کە حیسابێکی لە مێژوودا نەبوو، بوو بە جێگەی سەرنجی هەموو عالەم.
٥. قورئان ڕۆژانە دڵەکان فەتح دەکا.
٦. فرمێسک لە چاوان دەبارێنێ.
٧. سەدا و ئاوازی دنیا پڕ دەکا.
٨. موعجیزەکانی گوێی کافران کەڕ دەکا.
٩. ئیمان لە دڵەکاندا زیاتر دەکا.
١٠. ڕۆژانە دیراسەی نوێی قورئان چاو بە دنیا هەڵدێنێ.

یا ڕەب قورئان بکەیە بەهاری دڵەکانمان، ڕووناکی چاوەکانمان، لابەری خەمەکانمان و دەستمان بگرێ بۆ بەهەشت، ببێتە حیجاب لە ئاگر بۆمان، تکاکارمان بێ لە دواڕۆژ، ڕووناکی بێ بۆ گۆڕمان، بەڵگە بێ بۆمان، بەڵگە نەبێ لەسەرمان، یا ڕەب تای تەرازووی ئەو کەسەی پێ گران بکەی لە قیامەت کە ئەو نووسینە ئیلهامبەخشەی بۆ ناردم.

## فکرەی نەوەد و حەوتەم: بوونی سندوقی پێشنیار لە مزگەوتەکان

١. بۆ پرس و پرسیارە شەرعییەکان.
٢. بۆ پێشنیاری جوان.
٣. فکرەی جوان.
٤. ئاگادارکردنەوە لە کەموکوڕی.
٥. لە بەشی ئافرەتان و پیاواندا هەبێ.

## فکرەی نەوەد و هەشتەم: ئادابەکانی جەژن

١. حوکمی جەژن: هەندێک پێیان وایە واجبە، وە هەندێکیان بە سوننەتی موئەککەدەی دەزانن، گرنگ ئەوەیە بەبێ هۆ موسوڵمان نابێ لەم موناسەبە گەورەیە بەجێ بمێنێ.
٢. فەلسەفەی جەژن ئەوەیە کە مرۆڤی موسوڵمان کەرنەڤاڵی زاڵبوون بەسەر شەیتاندا دەگێڕێ.
٣. فەرمانی خودای بەجێهێناوە.
٤. ڕێگا و ڕێبازی پێغەمبەری ﷺ زیندووکردۆتەوە.
٥. زیاتر لەگەڵ موسوڵمانان تەعارۆف و تەعاون دەکات.
٦. خۆشی دەربڕینە.
٧. بەرزڕاگرتنی ناوی خودایە.
٨. بەرزڕاگرتنی دروشمەکانی دینە.
٩. بە دڵ خۆی بۆ ئامادە بکەین و بڕیاری بدەین تێیدا بەشدار بین.
١٠. خۆمان بشۆین.
١١. پێش ئەوەی بچین بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان چەند دەنکە خورما بخۆین.
١٢. بەشداری نوێژ بکەین.
١٣. بە پێ بڕۆین.
١٤. زوو بڕۆین.
١٥. گوێ لە وتارەکە بگرین.
١٦. بۆنی خۆش لە خۆمان بدەین.
١٧. بەرگی خاوێن و نوێ بپۆشین ئەگەر هەبوو.
١٨. ئەگەر زەکاتی فیترمان نەدابێ با بچین زوو بیدەین، نابێ لە ڕۆژی جەژن دوای بخەین.
١٩. ئافرەتان بەشداری بکەن.
٢٠. منداڵانی بۆ هان بدرێ.

٢١. ئەگەر بکرێ لە دەرەوەی مزگەوت بکرێ، بۆ ئەوەی هەموو کەس بەشداری بکات لە ئافرەت و بێبیانوو ر و بەبیانوو.
٢٢. لە شەوەکە و تا کاتی نوێژی جەژن زۆر (الله أكبر) و زیکری دیکەش بکەین.
٢٣. دەستمان بکەینەوە بەرانبەر ماڵ و منداڵان.
٢٤. گرنگیدان بە جێژنانە بۆ منداڵان بەپێی توانا، چونکە بە لای منداڵەوە زۆر گرنگە.
٢٥. کە گەڕاینەوە لە مزگەوت ڕێگا بگۆڕین.
٢٦. پیرۆزبایی و جەژنانە لە یەکدی بکەین کارێکی باشە.
٢٧. لە وتاری جەژن باسی ئادابەکانی جەژن بکرێ.
٢٨. خەڵک وریا بکەینەوە لە ڕەفتارە بێشەرعییەکان.
٢٩. خەڵک وریا بکەینەوە لەوەی لە ڕۆژی جەژندا سەردانی گۆڕستان نەکەن، بۆ ئەوەی جەژن لەوانی دیکەش تێک نەچێ.
٣٠. وریای ڕێکارە تەندروستییەکان بین، بۆ ئەوەی زیان بە خۆمان و خەڵک نەگەیەنین.
٣١. زۆر وریای خواردن بین، زیادەڕەوی تێدا نەکەین، بۆئەوەی تووشی کێشەی تەندروستی نەبین.
٣٢. منداڵەکان وریا بکەینەوە لە زیادەڕەوی لە خواردن.
٣٣. وریایان بکەینەوە لە شەڕەنگێژی، چونکە بەرکەوتنی زۆر لە نێوان منداڵاندا دروست دەبێ.

# فکرەی نەود و نۆیەم: بۆ دوای ڕەمەزان

١. کێ بەهرەمەندە لە ڕەمەزان؟ بێگومان ئەو کەسە بەهرەمەندە کە بەفعلی بەئیمانەوە بۆ خودا بەڕۆژوو بووە، وە ئەو کەسەش بە چاوی بەفرمێسکەوە لە پەرۆشی بۆ ڕەمەزان، بەڵام نەیتوانەوە بەڕۆژوو بێ لەبەر بیانووی شەرعی.
٢. ئەو کەسە بەڕۆژوو بووە کە توێشووی تەقوای بەدەست هێنا بێ، چونکە ئامانجی ڕۆژوو تەقوایە.
٣. ئەو کەسە بەڕۆژوو بووە کە لە گوناه دووربووە و ئەزیەتی خەڵکی نەداوە.
٤. ئەو کەسە بەڕۆژوو بووە کە ئەهلی خێر و سەدەقە بووە.
٥. ئەو کەسە بەڕۆژوو بووە کە تەوبەی کردووە و مافەکانی بۆ خەڵک گێڕاوەتەوە و گەردنی خۆی بە خاوەن هەقەکان ئازادکردووە.
٦. ئەو کەسە بەڕۆژوو بووە کە زمانی پاراو بووە بە قورئان و زیکر و دوعا.
٧. ئەو کەسە لە ڕۆژوو گەیشتووە کە دوای ڕەمەزان بەیەکجاری لاپەڕەکانی قورئان ناپێچێتەوە و دەستی بەخشندەیی ناقوچێنێ و لەمزگەوت غەریب و نامۆ نابێتەوە.
٨. با بەهۆی بەڕۆژووبوونمان مەغرور نەبین و وا نەزانین هەموو شتێکمان بەدەست هێناوە، چونکە کردەوە باشەکان بە کۆتایی دەردەکەون.
٩. شەرت نییە لەدوای ڕەمەزان وەک ڕەمەزان وا بین، بەڵام نابێ بپچڕێین لە کردەوە باشەکان، کەمبوونەوەی عیبادەت و چاکە ئاساییە، بەڵام پچڕاندنی نائاساییە.
١٠. بەردەوامی لەسەر چاکە زەمانی عاقیبەت خێرییە، چونکە خودای گەورە ستەم لە بەندەکانی ناکات.
١١. دەبێ دوعا بکەین دوای ڕەمەزانیش بەردەوام بین، واتا ڕەببانی بین نەوەک ڕەمەزانی.
١٢. نابێ لەوانە بین کە بە تاوانەوە داخلی ڕەمەزان دەبن و بە تاوانەوە دەردەچن.
١٣. ئەوانەی ڕەمەزانیان لەدەستچووە بە هەر هۆیەک، دەبێ دوای ڕەمەزان قەرەبووی بکەنەوە بە دووبارە گرتنەوەی ڕۆژووەکان یان دانی فیدیە.

١٤. دەبێ بزانی کردەوەی چاک ئەجەلێکی نییە جگە لە مردن، بۆیە دەبێ تا مردن بەردەوام بین.

١٥. لە خودا بپاڕێینەوە کە خودای پەروەردگار لێی قبووڵ کردبین و بترسین لەوەی کە شایەنی قبووڵ نەبوو بێ.

١٦. با دوای ڕەمەزان تەرکی شەونوێژ نەکەین، چونکە سوننەتێکی یەکجار گەورە و کاریگەرە، پیاوچاکان وەک فەرز گرنگیان پێداوە.

١٧. گرنگی بە سوننەتی ویتر بدەین، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ لە سەفەریشدا نەیچواندووە.

١٨. گرنگی بە نوێژی بەیانی بدەین، بەداخەوە دوای ڕەمەزان نوێژی بەیانی گریانت دێ.

١٩. با دوای ڕەمەزان نەیکەینە وەرزی دراماکان، بەتایبەت ئافرەتانی بەڕێز.

٢٠. با تۆزێک خۆمان لە مۆتەکەی مۆبایل و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ڕزگار بکەین، مەگەر لە کاری خێردا نەبێ.

٢١. گرنگی بە سوننەتی بەڕۆژووبوونی شەشەکان بدەین بۆ ئەوانەی کەساغ و تەندروستن.

# فکرەی سەدهەم: باسی قنووت

١. سوننەتی ویتر یەکێکە لە سوننەتە زۆر موئەککەدەکان بەدرێژای ساڵ.

٢. وە لە ویتردا قنووت خوێندن یەکێکە لە سوننەتەکان، ئایا بەدرێژای ساڵ بخوێنرێ یان بەس لە ڕەمەزان، یان بەس لە نیوەی دووەمی ڕەمەزان؟ بەپێی موتابەعەی ئەم بۆچوونانە هەموویان بەڵگەی خۆیان هێناوەتەوە، بەڵام زۆربەیان پێیان وایە بەدرێژای ساڵ لە کۆتا ویترەکان بخوێنرێ باشترە.

٣. دروستە لە هەموو نوێژەکاندا بخوێنرێ، بەتایبەت ئەگەر موسیبەت و بەڵا هەبێ.

٤. لای شافیعییەکان لە بەیانیان و نیوەی دووەمی ویتری ڕەمەزان دەخوێنرێ.

٥. هەش بووە لە زانایان وەک قەتادە تەنیا لە نیوەی یەکەمی ڕەمەزاندا نەبێ بەدرێژای ساڵ خوێندوویەتی.

٦. پرسیار لە ئەنەس کرا ئایا پغەمبەر ﷺ قنووتی خوێندووە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتیان: دوای ڕکوع یان پێش ڕکوع؟ فەرمووی: کەمێک دوای ڕکوع، ئەمەش لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە.

٧. فەرموودەکەی ئەبو هوڕەیڕەش کە لە بوخاریدا هاتووە تەئکید دەکاتەوە لەسەر قنووت لەدوای ڕکوع.

٨. وە زۆربەی زانایانیش هەر بۆچوونیان وایە، خەڵکی ئێمەش بەوە ڕاهاتووە، لە مەزهەبی شافیعیشدا هەر وایە و لە ڕووی دەلیلەوە بەهێزترە.

٩. وە سوننەتە دەست بەرزبکرێتەوە لە کاتی قنووتدا.

١٠. دوعای قنووت کە پێغەمبەر ﷺ فیری حەسەنی کوڕی عەلی کرد زۆر شامل و کامله: « قَالَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ رضي الله عنهما: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الْوِتْرِ - قَالَ ابْنُ جَوَّاسٍ: فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ -: " اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، إِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، وَلَا يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ " ».[١] وە هەر دوعایەکی دیکە بخوێنرێ دەبێ.

---

[١]- سنن أبي داود: ١٤٢٥.

١١. وا دەردەکەوێ قنووت وەک شەونوێژ فرەوانە، بۆیە با لەسەر خوێندن و نەخوێندنی قنووت کێشە دروست نەکەین.

١٢. نابێ قنووت ئەوەندە درێژ بکەینەوە خەڵک بێزار بکەین، بەو شێوەیە سوننەت نییە، کە جاری وایە دە دەقە زیاتر بەس دوعا دەخوێنرێ.

١٣. زۆر کەس هەیە دوعای وا دەکا سوننەت نییە، بۆ نموونە: ئەی خودایە هەر چی کافرە نەیهێڵی و منداڵیان هەتیو بکەی و ژنەکانیان بێوەژن بکەی، ئەم دوعایە تەنیا بۆ ئەهلی جەنگ دەوترێ، کە لە ڕاستیدا بۆ ئەوانیش ڕاست نییە.

١٤. پێغەمبەری خودا ﷺ ماوەیەک نەفرینی کرد لە هەندێک کافرەکان، دواتر نەهی لێکرا.

١٥. بەهیوای ئەوەی ڕەمەزانێکی تەواو بەکەیف و شادی و پڕ بەندایەتی و قبووڵکراو بێت.

# نێوەڕۆک


| ژمارەی فکرە | ناوی فکرە | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ١ | فەلسەفەی ڕۆژوو | ٩ |
| ٢ | پلە و پایەی ڕۆژوو | ١٢ |
| ٣ | چۆن پێشوازی لە ڕەمەزان بکەین | ١٩ |
| ٤ | پەیامی سیاسی ڕۆژوو | ٢٢ |
| ٥ | پەیامی ئابوری ڕۆژوو | ٢٥ |
| ٦ | پەیامی کۆمەڵایەتی ڕۆژوو | ٢٨ |
| ٧ | پەیامی تەندروستی ڕۆژوو | ٣١ |
| ٨ | سەرکەوتن و ڕووداوەکان لە ڕەمەزاندا | ٣٦ |
| ٩ | دەوری مزگەوت لە ڕەمەزان و ڕۆژوو | ٣٨ |
| ١٠ | گەورەیی و پێگەی مزگەوت | ٣٩ |
| ١١ | دەور و کاریگەریی مزگەوت | ٤٤ |
| ١٢ | لیژنەی مزگەوتەکان | ٤٦ |
| ١٣ | دەوری ئیمامە بەڕێزەکان لە ڕەمەزاندا | ٤٧ |
| ١٤ | گرنگیدان بە ئیمامەت لە ڕێی بەکارهێنان و یارمەتی وەرگرتن لە قورئانخوێنە دەنگخۆشەکان | ٤٨ |
| ١٥ | بۆ قورئانخوێنە ئازیزەکان | ٥٠ |
| ١٦ | بۆ ئیمامە بەڕێزەکان | ٥٢ |
| ١٧ | تەوبەی کچێکی توبەکار لە دەڤەری ڕاپەڕین | ٥٤ |

| ١٨ | دروستکردنی سەللەیەکی خواردەمەنی | ٥٦ |
|---|---|---|
| ١٩ | وتاری جومعە | ٥٧ |
| ٢٠ | دەوری ئافرەت لە ڕەمەزاندا | ٥٨ |
| ٢١ | ئافرەت و مزگەوت | ٦٠ |
| ٢٢ | خوشکان و خۆڕاگری لەسەر دین | ٦٣ |
| ٢٣ | ئافرەتان پەروەدەکاری پیاوە گەورەکانن | ٦٥ |
| ٢٤ | گرنگیدان بە منداڵ | ٦٧ |
| ٢٥ | بۆچی منداڵ تووشی لادان دەبێ؟ | ٦٨ |
| ٢٦ | گرنگیدان بە لەدایکبوونی منداڵ | ٦٩ |
| ٢٧ | پەروەردەی منداڵ لە ڕووی تەندروستییەوە | ٧٠ |
| ٢٨ | پەروەردەی سێکسی منداڵ | ٧١ |
| ٢٩ | پەروەردەی ئیمانی منداڵ | ٧٢ |
| ٣٠ | پەروەردەی سێکسی منداڵ | ٧٥ |
| ٣١ | پەروەردەی سۆزداری منداڵ | ٧٧ |
| ٣٢ | پەروەردەی خۆراکی منداڵ | ٧٨ |
| ٣٣ | پەروەردەی وەرزشی منداڵ | ٨٠ |
| ٣٤ | پەروەردەی کۆمەڵایەتی منداڵ | ٨١ |
| ٣٥ | پەروەردەی ژیری منداڵ | ٨٢ |
| ٣٦ | پەروەردەکاری سەرکەوتوو کێیە؟ | ٨٣ |
| ٣٧ | شێوازەکانی پەروەردە | ٨٥ |
| ٣٨ | کردنەوەی دەورە بۆ دەستنوێژ بۆ منداڵان | ٧٨ |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٩ | کردنەوەی دەورەی تایبەت بە قورئان خوێندن و لەبەرکردن و کرنەوەی پێشبڕکێ و پاداشتکردن بە ماددی و مەعنەوی | ٨٨ |
| ٤٠ | کردنەوەی دەورەی کتێب خوێندنەوە و تێگەیشتن لێی و پاداشتکردن لە ڕەمەزاندا | ٨٩ |
| ٤١ | پاداشتکردنی ئەو کەسانەی زۆرترین خزمەتیان بە مزگەوت کردووە لە ڕووی پاکوخاوێنی لە ڕەمەزاندا | ٩٠ |
| ٤٢ | دەستخۆشی و پاداشتکردنی ئەو گەنج و منداڵانەی کە زۆرترین ئامادەییان هەبووە لە نوێژەکان بە جەماعەت لە مزگەوتدا | ٩١ |
| ٤٣ | بوونی کتێبخانە لە ماڵ و لە مزگەوت زۆر گرنگە و سەرچاوەیەکی گەورەی ڕۆشنبیری و مەعریفییە | ٩٢ |
| ٤٤ | شەونوێژ، تەڕاویح | ٩٣ |
| ٤٥ | گەورەیی شەونوێژ و تەڕاویح لە قورئاندا | ٩٤ |
| ٤٦ | شەونوێژ لە فەرموودەی سەروەرماندا ﷺ | ٩٦ |
| ٤٧ | شەنوێژ بۆ؟ | ٩٨ |
| ٤٨ | پیاوچاکان چییان دەربارەی شەونوێژ وتووە؟ | ١٠٠ |
| ٤٩ | بەشێك لە شەونوێژی ئافرەتە ساڵحەکان | ١٠٢ |
| ٥٠ | پێغەمبەر ﷺ چۆن شەنوێژی کردووە؟ | ١٠٤ |
| ٥١ | چۆنیەتی ویتر کردن | ١٠٦ |
| ٥٢ | تەڕاویح | ١٠٨ |
| ٥٣ | حوکمی تەوبەکردن و ئەحکامەکانی | ١١٠ |
| ٥٤ | مەرجەکانی گیرابوونی تەوبە | ١١٣ |
| ٥٥ | ئاستەنگەکانی بەردەم تەوبەکردن | ١١٤ |
| ٥٦ | چەند ڕێنماییەك دەربارەی تەوبە | ١١٧ |
| ٥٧ | بۆچی تەوبە بکەین؟ | ١١٩ |

| ٥٨ | چۆن بەردەوام بین لەسەر تەوبەکەمان؟ | ١٢١ |
|---|---|---|
| ٥٩ | وتە جوانەکان دەربارەی تەوبە | ١٢٥ |
| ٦٠ | چیرۆکی تەوبەکاران | ١٢٦ |
| ٦١ | ئەمڕۆ زۆرترین تاوان لە ڕێی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان تووشمان دێ | ١٢٨ |
| ٦٢ | ئادابەکانی ڕۆژوو | ١٣١ |
| ٦٣ | ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن، یان ناشکێنن | ١٣٣ |
| ٦٤ | لە خزمەت قورئاندا، قورئان ناو و نێوەڕۆك | ١٣٦ |
| ٦٥ | ئەدەب لە خزمەت قورئانی پیرۆزدا | ١٤٠ |
| ٦٦ | ئەرکەکانمان بەرانبەر قورئانی پیرۆز | ١٤٢ |
| ٦٧ | ئامانجە گشتی و سەرەکییەکانی قورئانی پیرۆز | ١٤٣ |
| ٦٨ | دانانی لەوحەیەك (سەبورەیەك) | ١٤٤ |
| ٦٩ | گەورەیی قورئان خوێندن | ١٤٥ |
| ٧٠ | ئادابەکانی فێرخواز و فێرکاری قورئان | ١٤٧ |
| ٧١ | قورئان و موعجیزە | ١٤٩ |
| ٧٢ | پلە و پایەی ڕۆژوو | ١٥١ |
| ٧٣ | فەلسەفەی زەکات | ١٥٥ |
| ٧٤ | زەکات لە چی بدەین؟ | ١٥٧ |
| ٧٥ | زەکات بدەین بە کێ؟ | ١٥٩ |
| ٧٦ | چەند بابەتێکی گرنگی زەکات | ١٦١ |
| ٧٧ | پێشخستن و دواخستنی زەکات | ١٦٣ |
| ٧٨ | زەکاتی باوك و دایك و کوڕ و کچ بۆ یەکدی | ١٦٤ |

| ٧٩ | ڕاكردن له زەكات | ١٦٥ |
|---|---|---|
| ٨٠ | زەكاتی فیترِ و زەكاتی سەرفیترە | ١٦٦ |
| ٨١ | زەكاتی فیترِ | ١٦٧ |
| ٨٢ | چی بدەین له سەرفیترە؟ | ١٦٨ |
| ٨٣ | كەی زەكاتی فیترِ بدەین؟ | ١٦٩ |
| ٨٤ | پایه و پێگەی شەوی قەدر | ١٧٠ |
| ٨٥ | شەوی قەدر كەیە؟ | ١٧٢ |
| ٨٦ | له شەوانی قەدردا چی بكەین؟ | ١٧٣ |
| ٨٧ | باسی ئیعتیكاف | ١٧٤ |
| ٨٨ | گەورەیی زیكر | ١٧٦ |
| ٨٩ | سوودەكانی زیكر | ١٧٩ |
| ٩٠ | سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ و سوودەكانی | ١٨٢ |
| ٩١ | له چ كات و شوێن و حاڵێكدا سەڵەوات لەسەر سەروەرمان ﷺ بدەین | ١٨٤ |
| ٩٢ | جۆرەكانی دوعا و مەرجەكانی | ١٨٦ |
| ٩٣ | ئادابەكانی دوعا | ١٨٨ |
| ٩٤ | كات و شوێنی گیرابوونی دوعا | ١٩٠ |
| ٩٥ | چیرۆكی گیرابوونی دوعا | ١٩٢ |
| ٩٦ | لەتیفەیەكی جوان دەربارەی قورئان | ١٩٤ |
| ٩٧ | بوونی سندوقی پێشنیار له مزگەوتەكان | ١٩٥ |
| ٩٨ | ئادابەكانی جەژن | ١٩٦ |

